

بیار بیوون



# جیهان له دیدی کوشنیر

وەرگێرانی

شێرزاد هەینی

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com



لەبلاوكراوەكانی سەنتەری لێكۆڵینەوەی فیكریی‌و ئەدەبی نما
زنجیرەی( ٧٩)

سەرپەرشتیكردنی پرۆژەی چاپی كتێب
ئیسماعیل كوردە، رێبین رەسوڵ

ناوی كتێبەكە بەزمانی فەرەنسی: Le monde selon k.
ناوی كتێب بەكوردی: جیهان لەدیدی كۆشنێر
نوسینی : بیار بیون
وەرگێڕانی: شێرزاد هەینی
ژانر: سیاسەت
پیت چنین: وەرگێڕ
دیزایین: نما
بەرگ: ئارام عەلی
تیراژ: ٥٠٠
چاپی یەكەم: كوردستان/ هەولێر ٢٠١٠
مافی لەچاپدانەوەی بۆ گۆڤاری نما پارێزراوە

## ڕونکردنەوەیەك

کتێبەکە بە زمانی فەرەنسی نووسراودو بە زەنجیرە لە ڕۆژنامەی ئەلقەبەسی کوێتی لە مانگی فبرایری ساڵی ٢٠٠٩ دا بەناوی جیهان لە دیدی تۆ (ك) بڵاوکراوەتەوە، پیتی (ك)کەش ئاماژەیە بە یەکەم پیتی ناوی برنار کۆشنێری وەزیری دەرەوەی فەرەنسا. نووسەرەکە کۆششی کردووە، زۆر خاڵی ڕەش لە کارنامەی ئەو دبلۆماتە، یان ئەو سەفیرە چاکخوازە بدۆزێتەوە، یان بۆی دروست بکات. ئەگەر بەوردیش کتێبەکەو بۆچوونی نووسەرەکە بخوێنیتەوە، دیارە کەوا کۆشنێر دکتۆرێك و دبلۆماتێکی واقیعبین بووە، بەردەوام بۆ سەرکەوتنی ئەو میللەتانە کاری کردووە کە چەوساونەتەوە. لە هەموو شوێنێکی گرداو کۆچڕەوو مەترسیدارەکان پیاوێکی خێرخوازبووە.

نابێ ئەوەش لەبیر بکەین، کتێبەکە لەلایەن وەرگێڕێکی عەرەبەوە ئامادەکراوە، دیارە ئەویش دەستبژێرێکی لە بڕگەکانیش کردووە، ئەگەرنا ئەو پیاوە وەك چۆن کورد ناسیوویانە، ئەو لە مەیدانەکانی خێرخوازییدا سوارێکی سپی بووە. لە کۆچڕەوەکەی بەهاری ١٩٩١ دڵسۆزانە فریای کورد کەوتوودو لە یەکەمین دانیشتنی پەرلەمانی کوردستانیش لە هەولێر هاوشانی دانیال میتران ئامادەبووە. ئێمە ئەوەمان دەقاودەق لە عەرەبییەوە کردووتە کوردی.

شێرزاد هەینی
ستۆکهۆلم _ ئەپریلی ٢٠٠٩

# پێشەکییەک بۆ وەرگێڕانە عەرەبییەکەی ڕۆژنامەی ئەلقەبەس

نووسەرەی فەرەنسی (بیار بیون) کتێبێکی تری نوێی بەناوی (جیهان لە دیدی تۆ . ک.) چاپ دەکات، کە تێدا پەردە لە زۆر لایەنی هەستیار لەسەر ژیانی برنار کۆشنێری وەزیری دەرەوەی فەرەنسی هەڵدەداتەوە، بەپێی ڕاپرسییەکان ئەو پیاوە سیاسەتمەدارە لەناو سیاسییەکاندا ژمارەی یەکەمی لە ناسین و ناوداری بەردەکەوێت. ئەوەی ئێستا لە پێش ئەودایە، دەبێ ئەو وێنەی (سوارە سپییەکە)ی خۆی بپارێزێت، کە لە میدیاوە بەدەستی هێناوە، بەوەش توانی ماوەیەکی زۆر لەو پێگە سیاسییەدا بمێنێتەوە.ئەو کتێبەی بیار بیون لە فەرەنسا بە (کتێبی شۆکبوون) دەناسرا، کە وێنەی کۆشنێری لەبەر چاوی فەرەنسییەکان دەخات، ئەگەری ئەوەش هەیە لە گۆڕانکاری حکومەتدا ئەو جارە وەزارەتی دەرەوەی لەو وەربگیرێتەوە. نووسەرە فەرەنسییەکە کۆشنێری بە کەسێکی فەرەنسی خراپ ناو دەبات، ئەو کەسەی کە کاریگەری ئەنگلۆسکسۆنی پێوە هەیە، کە لەکاتی وتنەوەی سروودی نیشتیمانی بریتانی هەڵدەستێتەوە کە تێدا دەڵێت (خودا شاژنمان بپارێزێت)، بەڵام کە سروودی نیشتیمانی فەرەنسی لامارسییز لێدەدرێت بۆ ڕێزگرتنی سروودەکە هەڵناستێتەوە. نووسەرەکە جوولەکەیی دوولایەنی ئەو دەسەلمێنێت، ئەوەش مەکینەی سەرەکی جوولەو هەموو هەڵوێستەکانی ئەون.

بیار بیۆن وا دەزانێت کەوا کۆشنێر لەو پلانە ئەمریکییەی لە ڕوانداو بۆسنەو فەلەستین و کۆسۆفۆ دەکرێن، ئەو دەستی هەبووە، کە تێدا کۆشش دەکات دەوڵەت و هەرێمەکان هەڵوەشێنێتەوەدو نەخشەکان بگۆڕێت، لە کتێبەکەدا چەندین ڕووداو دەگێڕێتەوە کە پاڵەوانە ڕاستەقینەکەی کۆشنێرە، ئەوەی یەکێکە لە دامەزرێنەرانی ڕێکخراوی پزیشکانی بێ سنوور. کۆشنێر لێرە بەوە تاوانبارە، کەوا وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسی کە خۆی وەزیرەکەیەتی بۆ ئەو مەسەلەیەو مەرامەکانی خۆی قۆرخکردووە، تا حکومەتە ئەفریقییەکان ناچار بکات ڕاپۆرتە دواکەوتووەکانی ڕێکخراوەکەی لەسەر ڕەوشی تەندروستی لەو وڵاتانەدا وەرگرێت.

لەو کتێبەدا کە لەلایەن ڕۆژنامەی (القبس)ی کوێتی بە عەرەبی بڵاوکراوەتەوە، بیار بیۆن بە بیر خوێنەرانی دەهێنێتەوە کەوا ئەو چۆن ژنەکەی خۆی لەناو گەرمەی ململانێی توندی بەرژەوەندییەکاندا دەکاتە بەرێوەبەری ڕاگەیاندنی دەرەوە _ بیستراوو بینراو _، کە تێدا چەند ژوورنالیستیان لە تەلەڤزیۆنی فەرەنسا ٢٤ و ئیستگەی فەرەنسای دەوڵی لەسەر کار دەرکردووە، کە نارازیبوون بە دامەزراندنی هاوسەرەکەی کۆشنێر لەو پۆستەدا. دەزگاکانی ڕاگەیاندنی فەرەنسی ئاماژە بەوە دەدەن، کەوا کەسانی نزیك لە کۆشکی ئالیزێ و ڕاوێژکارەکانی سەرۆکی فەرەنسی نیکۆلا سارکۆزی چەندین بەڵگەو وەسڵیان بە نووسەری ئەو کتێبە بیار بیون داوە، کە تێدا کۆشنێر بە چەندین هەڵەو تاوان تاوانبار دەکەن، بەڵام ئەو قسانەو ئاماژەدان بەو ڕاپۆرتانە کۆشنێر لەپێش چاوی سارکۆزی سووك ناکات و بەردەوام دەبێت لە پشتیوانیکردن لە وەزیری دەرەوەی. لە دوا دیمانەی تەلەڤزیۆنییدا سەرۆکی فەرەنسی پشتیوانی بە وەزیرەکەی ڕادەگەیێنێت، کە ماوەی هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتیدا ئەو بەروونی و بەئاشکرا هاوپشتی و هاوکاری ئەیارەکەی (سیگۆلین ڕوایال) بووەو کاریشی کردووە ئەو ژنە لەو هەڵبژاردنەدا دەربچێت. سارکۆزی وتوویەتی من پشتیوانی لەو پیاوە دەکەم لەبەر هیچ نەبێت لەبەر نووسینی ستوونە ڕۆژنامەگەرییەکانی. پرسیارەکەش لەو ڕۆژانەدا ئەوەیە، ئایا وەزیرەکە تا چەندو تا کەی خۆی ڕادەگرێت، ئایا دەرچوونی ئەو کتێبە ئەو دەرووخێنێت...؟ کۆشنێر وەڵامی ناوەرۆکی کتێبەکەدا دەداتەوەو بە نادروستیان ناودەبات، لە گۆڤاری (لۆنۆڤیل)دا وتبووی: زۆر ئەگەرو بژار لە پشت ئەو کتێبەو ئەو تاوانبارکردنەی من هەیە، لەوانە غیرەو چاوهەڵنەهاتنی هەندێ لە دەزگاکان بە چالاکییەکانی من، جا چ ئەوانەی لەناو حکومەتن، یان لە ئەوانەی لە دەرەوەی بازنەی حکومەت دەردەکەون، من ئەوانە لەناو چەپەکان و ڕاستڕەوەکاندا دەبینم. هەندێ لە چاودێران و کەسانی ئاگاداریش وا دەزانن تۆڕەکانی فەرەنسی کارکەرو کاریگەر لە وڵاتانی ئەفریقی دەخوازن بەڕەکە لە بن پێی کۆشنێر دەربهێنن، زۆریش لایان گرینگ نییە وەزیرەکە چارەنووسەکەی دەگاتە کێندەرێ.

# جیهان لەدیدی کۆشنێر

## ئەگەر نیوەم ببێتە جوولەکە
## کەواتە من دووجار جوولەکەم

کەس بۆی ناکرێت ناوو کەسایەتی سونبلێك کەم بکاتەوە! ماوەیەکی دوورو درێژیشە کەوا کۆشنێر بوویتە سونبلێك، بەپێی راپرسییەکان بە بۆچوونی فەرەنسییەکان کەسایەتی کۆشنێر بوویتە کەسی زۆر ناسراوی فەرەنسا، ئەوان وەك سیاسییەکی ئاسایی سەیری ئەو ناکەن و بەس، بەڵکو وەك پزیشکێکی لێزانی فەرەنسیش ناسی دەکەن، ئەگەرچی ئەو ماوەیەکی درێژە بەدلە سپییەکەی دکتۆری لەبەر نەکردووە.

بەو شێوەیەو بەو پێناسەیە فەرەنسییەکان، پێناسەی کۆشنێر دەکەن:

(ئەو پیاوە پاڵەوانی سەردەمەکەیە، بۆ یارمەتی و گەیشتن بە شوێنی ڕووداوەکان و کارەساتەکان زۆر خێرایە، دەگاتە هەموو گۆشەیەکی جیهان ئەگەر پێویستیان بە یارمەتی ئەو هەبێت، بەلەز دەگاتە قوربانییەکان، ئەو پیاوە تاکە کەسی فەرەنسییە کە دەتوانێت ژیاننامەی خۆی دەرباز بکات).

نووسەری بیرەوەرییەکانی ئەو (میشال ئینتۆن بورینی) کە ژیاننامەکەی ئەو دەردەکات، کە لەسەر شاشەی تەلەڤزیۆنەکانەوە دەردەچێت، دەزگاکانی ڕاگەیاندن و توێژە سیاسییە دەسەڵاتدارەکانیش کاردانەوەی ساردو خراپیان لەسەر ئەو کتێبەی میشال لەسەر ڕۆژانەی کۆشنێردا نەبوو.

کۆشنێر وزەی ڕاکێشانی زۆری بۆ چاوی کامێرەکان هەیە، میدیاکان زۆر کۆدەکاتەوەو ئەوانیش بە پەرۆشەوە سۆراخی ئەو دەکەن، ئەوەش بۆچوونی ئەو کەسانەیە کە چەپڵەی بۆ لێدەدەن و خۆشییان دەوێت. بەکورتی ئەو پیاوێکی خۆپەرستە، من بەپێچەوانەی ئەوان پێناسەی ئەو پیاوە دەکەم، من دەزانم کۆشنێر ناتوانێت لەگەڵ ئەو بەهایانەی دایکم کە لە تەمەنی گچکەیەوە لەناخمدا چاندوویەتی، ئەو هاوسەنگی بکات، دایکم منی فێرکردووە من هەرگیز خەڵك نەورووژێنم و لە شوێنی خۆمدا بمێنمەوە. من ئەوەم لە ڕێساکانی پەروەردەکردنی خۆمم لەبیرماوە، بۆیەش کە لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٩٢ بینیم چۆن کۆشنێر یارمەتی کرێکارە باڵهەڵگرەکان لە مقادیشوی سۆماڵ دەدات، کە فەردە برنجەکانیان دەگواستەوە، من هەستم بە بێزاری کرد. لەوەدەمانەدا کۆشنێر سێ باری لەسەر شانی خۆیدا باردەکرد، من ئەوەم نەدەزانی ئەو دیمەنەی سێ جار بۆ کامێرەکان دووپاتکردیتەوە، تا دیمەنەکان لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان دەربکەوێت، من زۆرم لا سەیربوو کەوا ئەو پیاوە چۆن پشتیوانی لەشەڕەکەی عێراق لە نێوان ساڵانی ١٩٩١ تا ٢٠٠٣ دەکرد. ئەوانەی پێشتر کتێبەکەی منیان بەناوی (کەسە نەناسراوەکەی ئالیزێ)یان خوێندبێتەوە کە لەسەر جاك شیراك نووسیبوم، تێگەیشتوون کەوا من بەرگری لەکەس ناکەم، تەنها کاری من ئەوەیە بە باشترین شێوە لە زانیارییەکان بکۆڵمەوەو لەسەر بەڵگەنامەکان کاربکەم، ئەوانەش دەتوانن ڕاستییە ڕەسمییەکان یەکلابکەنەوە. ڕاستی ڕەسمی ناوسراویش لەسەر کۆشنێر ئەوەیە، ئەو پیاوە کەسێکی ئاشتیخوازەو پارێزەرێکی داکۆکیکەرە لەکەسانی بێ پشتیوان و داواکاری مافەکانی مرۆڤ و دیموکراسییە، بەڵام هەڵسوکەوتەکانی ناو وڵاتانی ئەفریقیا ئەوی شکاندووە، دیارە ئەو کارانەش چەندین ڕاپۆرت و تێبینی و شرۆڤەی زۆری دەوێت.

****

# سیاسەتەکانی ئەو سەبارەت بە رواندا

کیشوەرە رەشەکە لە سەرەتاوە بۆ کەسێکی وەك کۆشنێر کراوەتە (باخچە نهێنییەکە)، کە تێدا بەربەردکانێیەکانی تێدا گەرم بوون و بە جۆرێك بوون کە لە جیهاندا وێنەیان نەبووە. ئەو لە ئەفریقیا بەردەوام کیسەیەکی لەسەرشان بووە، بەڵام کیسەکە بەردەوام برنجی تێدانەبووە، ئەگەر برنجیشی تێدابووبێت ئەوەش لەبەردەم کامیراکان بووە، بەڵام نابێت زوو بڕیاربدەین و بە پێش رووداوو لێکۆڵینەوەکان بکەوین.

لەو رۆژەی کۆشنێر گەیشتوتە کیدروسی (وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسی)و لەو ساتانەی ئەو سیاسەتە نوێیەکەی سەبارەت بە رواندا خستوتە روو. من کتێبێکم لەسەر ئەو کێشەیە نووسیبوو، لەوێدا گەیشتومەتە ئەو راستییەی کەوا (هوتوییەکان) نەتەوەی خوێنرێژبوون و نەتەوەی توتسییەکانیش قوربانییەکە بوون، لەو شەرەشدا فەرەنسییەکان پشتیوانی هوتوییەکان بوون بۆ قڕکردنی بەرامبەرەکان لە توتسییەکان. بۆ یەکەمجار لە مێژووی دبلۆماسیەتی فەرەنسییدا کۆشنێر لە مانگی مایۆی ساڵی ۲۰۰۷ دەست بۆ سەرۆك دەوڵەتێك درێژدەکات نەك هەر بەرپرس بووە لە شاردنەوەی راستییەکانی تراژیدیای رواندا، بەڵکو ئەو سەرۆکە بە دیدی قەزای فەرەنسی بەرپرسی یەکەمی راستەوخۆبووە لە کارەساتەکان و ئەویش وەك کەسێکی تاوانباری جەنگ دەناسێنێت، هەروەها قەزای ئەسپانیش ئەو بە بەرپرسی جینوساید لە رواندا دەناسێت.

من کە لە ۲٦ی یولیۆی ساڵی ۲۰۰۷دا زانیم وەزیری دەرەوەمان بە تەلەفۆن پەیوەندی بە سەرۆکی رواندی (بۆل کاگام) کردووە بۆ نوێکردنەوەی پەیوەندییە دبلۆماسییەکان لەگەڵ حکومەتی فەرەنسی شۆك گرتمی. من کە زانیم کۆشنێر سەرقاڵی ئەوەیە داوەتی کەسێکی وەك کاگام دەکات زۆر سەرسام بووم، زۆرتر سەرسام بووم کە کۆشکی ئالیزێ هیچ بەرهەڵستییەکی

نەنوواند، ئەگەرچی وەزیری بەرگرییش تێکداری کردوونەتەوە. من زۆر سەرسامم کە زانیم سەرداری دبلۆماسییەتی فەرەنسی هیوادارە لەگەڵ ئەو دەوڵەتە پەیوەندی ببەستێتەوە، کە زووتر پەیوەندییەکانی پاش بیرخەرەوەی قازی (بروکییر) داواکاربوو چەند کەسێکی نزیك لە بازنەی سەرۆکی رواندی بگیرێن. دەبووایە ئەو وەزیرە نوێنەرایەتی کۆمار بکات، کار بکات بۆ بەردەوامی دەوڵەت، بەڵام کۆششەکانی کۆشنێر بۆ ئاشتبوونەوە لەگەڵ (کیگالی)ی دیکتاتۆر، هەموو کۆشش و کەسایەتییە سیاسییەکان و سەربازییەکان و قازییەکانی پەراوێز دەکات و سەرکووت دەکاتەوە، ئەوانەی کە پێش چەند ساڵێك (بۆل کاگام) ئەوانەی بە بەرپرسی جینوسایدەکە ناوبردبوو، هەر ئەو کەسە قازی (بروکییر)ی بە مرۆڤێکی بەتاڵ ناوبردبوو.

## هەڵەی کۆشنێر

من لە رۆژنامەی لیبراسیوندا وتارێکم بەناونیشانی (هەڵەی کۆشنێر) بڵاوکردەوە، کە کۆشنێر لە سەر پەیوەندییەکانی بە رژێمی رواندا بەردەوام بوو، ئەو رژێمەی پێناسەی فەرەنسای بە ناشیرینترین شێوە ناوبردبوو. من بەناچاری وتارێکی ترم لەسەر ئەو بابەتەو ئەو وەزیرە نووسی، دیارە ئەوەش تێنوویەتی نەشکاندم، ئەوەی لەهەناومە بەتاڵ نەبوون، بۆیە لەو رۆژەوە زۆر بە پەرۆشییەوە کارم لەسەر کەسایەتی ئەو کەسە کردووە، وا کارنامەکەم سنووری بابەتی رواندا دەبەزێنێت. کۆشنێر لەپێناوی ناوی (فرانس دکتۆر) خەباتی کردووە، بۆ رازیکردنی دیکتاتۆرە هاورێیەکەی رەوشی وڵاتەکەی دەخستووتە ناو گرەوەکە، ئەوەی هەموو ژیانی خۆی بۆ دروستکردنی وێنەی ئەسپە سپییەکە تەرخانکردووە.

من کۆششم کردووه تا له هەموو هەڵسوکەوت و چالاکییەکانی بزانم بۆ نەودی وێنەی ئەو پیاوە بە فەرەنسییەکان بناسێنم، دەمەوێ بزانم مانای چییەو بۆ ئەو پیاوە ڕێز لە سروودی نیشتیمانی بریتانی دەگرێت، بەڵام بەبێ بایەخەوە سەیری سروودی نیشتیمانی فەرەنسی دەکات...؟ ئایا ئەوەیان گاڵتەکردنە...؟ یان ئیستفزازکردنە...؟ ئایا ڕاستە ئەو پیاوە کەسێکی بەخشندەو مرۆڤدۆستە...؟ کە زۆربەی فەرەنسییەکان بەو دیمەنانە دەیبینن.
من بڕیارمدا زۆرترین شت لەسەر ئەو کەسە بزانم کە نووسینگەی وەزیری دەرەوەی گرتووە، من هەرگیز نیازم نییە هەر حەوت بوارەکەی لەیەکتری جیابکەمەوەو پلەداریان بکەم، وەك چۆن نووسەری ژیاننامەکەی ئەو ئەنتۆن بوورینی کردوویەتی. داوام لێ نەکراوە هەموو جیاوازییەکانی ناو دۆسێیەکانی لەنێوان وێنەکانییدا کۆبکەمەوە، بۆ ناسینی وەك خۆشەویستێکی فەرەنسییەکان و ڕاستییەکەی کاتی زۆری دەوێت.

## مەترسیە ڕاستەقینەکە

کۆشنێر بۆ فەرەنسییەکان مەترسییەکی کوشندەیە، ئەو پیاوەی کە جاران بە جلی سپییەوە وەك سکرتێری دەوڵەت و وەزیری تەندروستی بوونی هەبوو، ئەودەمانە مەترسی نەبوو، بەڵام کە پۆستی وەزارەتی دەرەوەی وەرگرتووە مەسەلەکە گۆڕاوە، بۆیەش دەبێ فەرەنسییەکان زۆر نیگەران بن و هەست بەترس بکەن.
لەڕاستییدا ئەو پیاوە پیاوی بڕاندنەوەی ژمارە یەکە، لە سەردەمی سارکۆزییدا، برنار کۆشنێر خەون بەوە دەبینێت تەمەنی پەنجا ساڵەی سیاسەتی دەرەوەی فەرەنسای سەربەخۆ ڕەش بکاتەوە، دوودڵ نەبوو لە ساڵی ٢٠٠٣دا سەربازی فەرەنسی ڕەوانەی عێراق کرد، چ بەو بە نەفسیەتی ئەو

دکتۆرە دەڵێیت ئێستا بەرگری لە جەنگ دەکات...؟ بۆیەش لە گۆڤاری ماریانی رۆژی ١٨ی سپتەمبەری ساڵی ٢٠٠٧دا نووسیبوی:

(ئێمە زۆر بەخێرایی لە دکتۆرانی جیهانەوە دەگۆڕێین بۆ سەربازەکانی بێ سنوور).

بۆیەش پێویستە ئێمە لە وشەی (جەنگاوەرەکان) باش تێبگەین و وشەی (ئاشتی)یمان لەبیربێت، ئەو وشەیەش لەناونیشانی کتێبەکەی ئەودا (جەنگاوەرەکانی ئاشتی)دا هەیە، تێدا (فرانس دکتۆر) لە یەکەم کاریدا لە کۆتایی شێستەکانی سەدەی رابردوودا لە بیافرای نایجیری داوا دەکات بەزووترین کات فڕۆکەی جەنگی بۆ رەوانە بکەن، لە زۆر شوێنیشیدا بۆ شەڕکردن داوای سەربازی فەرەنسی کردووە، وەك ئەوەی لە ساڵی ١٩٨٧دا لەگەڵ (ئەندری گلۆکسمان)و (ئیف مونتاند) داوا دەکەن بە بەرنامەو هێدی هێدی لە وڵاتی تشادەوە هێرش بکەنە سەر پێشەوای لیبی موعمر ئەلقەزافی.لە نۆڤمبەری ساڵی ١٩٨٩دا پاش ئەوەی ئەوان دەگەڕێنەوە سەر دەسەڵات، ئەو بیر لەوە دەکاتەوە تیمێکی دەولی دژی خومێرە سوورەکان رەوانە بکرێت. ئەو داوایکردووە هێرش بکرێتە سەر سەربستان و ئیدارەیەکی کاتیش بۆ کۆسۆفۆییەکان دابنێن، وەك دیاریشە لەسەر قڕکردنی نەژادی سەربییەکان ئەو هیچ قسەو بۆچوونی نەبووە. کە ئەو گەیشتووتەو ئەو پۆستە باڵایەی وەزارەتی دەرەوە، ئەو بەلەز لەگەڵ ئەوەدا نەبوو لەگەڵ ئەو کەسە نزیك ببێتەوە کە فرانسوا میترانی بە هاوسۆزی قڕکردنەکەی تاوانباردەکرد، بەڵکو خەونی سەرەکی ئەو تەنها ئەوەبوو پەیوەندییە دبلۆماسییەکان لەگەڵ ئەو وڵاتانە بپچرێت، کە ئەو لە خانەی وڵاتە خوێنرێژەکانی پێناسە کردبوو. سەبارەت بە ئێران کۆشنێر بەو پەیامەیە قسەیەی بۆ فەرەنسییەکان کردووە:

(چاوەڕوانی رەوشی خراپتر بکەن).

لەو شوێنەدا کۆشنێر ئەگەری شەڕ بە نزیك دەزانێت، چونکە ئەو حەزی لە شەڕەو خۆشی بە جلی سەربازی جوان دەبینێت.

# کۆشنێرو وڵاتی تشاد

هاوڵاتیان لە کۆتایی هەفتەداو لە مانگی فبرایری ساڵی ۲۰۰۸دا زۆریان لا سەیربوو کە یاخیبووەکان هێرشیان کردە سەر (نجامینا)و سەرۆك (نیدریس دیبی)یان لەکۆشکی کۆماریدا گەمارۆدا، لەودەمانەدا کۆشنێر بە هۆی سەرپەرشتیکردنی شانەیەکی کیدورسی، لەگەڵ وەزیری بەرگرییەکەو بەرێوەبەرایەتی گشتی ئاسایشی گشتی و لە گەڵ سەربازەکان لە تشاد تەلەفۆن دەکات، لەوێشەوەو دەقە بە دەقە سۆراخی پێشرەوی یاخیبووەکان دەکات، پرسیاری ئەوەش دەکات:

(دەکرێ ئەوان بتەقێنینەوە...؟).

یان سەبارەت بە کێشەی دارفۆر دەیووت:

(با بچینە شەڕەکە).

کۆشنێریش وەك لە زۆر لە هاوڕێیەکانی زۆر دلڕەقانە وشەی قڕکردن بۆ بۆیەکردنی دەستێوەردانی سەربازی بە بۆیەکی شەرعی ناودەبات. ئەو زاراوەی لە بیافرای نایجیراو کوردستان و لوبنان و ئەریتریاو سۆماڵ و کۆسۆفۆ بەکارهێناوە. سەبارەت بە رواندا فرانسوا میتران بڕیاری دەستێوەردانەکەی بۆ راگرتنی قڕکردنەکە بە سیاسەتێکی نادروست پێناسەکردووە، یان بە هەڵەی ئیجرامی ناوبردووە. ئەو گیانبەخشینەی لێرەو لەوێ لە جیهاندا کراوە بۆ کەمکردنەوەو سووککردنی ئازارو ژانی خەڵکەکە، بەرگی تری پۆشیوەو لە ئێمەش دیار نەبووە، زۆرجار ئەسپە سپییەکە لەناو سەرکردە ئەفریقییەکاندا رەنگە ئەسلییەکەی خۆی گوم کردووە. تا باش ئاگاداری ئەو کارەساتانە بین کە برنار کۆشنێر فەرەنساو فەرەنسییەکانی تێوەگلاندووە، دەبێ بۆ دواوە بگەڕێینەوە بۆ سەردەمی (فرانس دکتۆر).

## لێدوانە سەرلێشێواوەکان

کۆشنێر بەردەوام دەگەڕێتەوە سەر ئەو ڕۆژانەی ژیانی کە شەرعیەت دەداتەوە چالاکییەکانی خۆی، ئەو لە ڕۆژی ٥ی ئۆکتوبەری ساڵی ٢٠٠٨دا لە قودس وتبووی تا ئیمرۆش سەرۆکی ڕێکخراوی (پزیشکانی بێ سنوور)و (پزیشکانی جیهان)م، بۆیەش ڕێکخراوە دەوڵەتییە ناحکومییە فەرەنسییەکان لە هەموو ڕووداوەکانی کەرتی غەزە ئاگاداری دەکەنەوە. پاش ئەو لێدوانەی ئەو لە قودس، ڕێکخراوی پزیشکانی بێ سنوور بەیانێك بڵاودەکاتەوەو تێدا ئاماژە بەوە دەدات کەوا زانیارییەکانی کۆشنێر هەڵەیەو ئەو هیچ پەیوەندی بە چالاکییەکانی ئێمە سەبارەت بە هاوڵاتییە فەلەستینییەکان لە غەزەدا نییە، هەروەها لە بەیانەکەدا نووسرابوو، کەوا کۆشنێر لە ساڵی ١٩٧٩ەوە پەیوەندی بە ڕێکخراوەکە نەماوە. سەبارەت بە وەڵامی ڕێکخراوی پزیشکانی جیهانیش، ئەوانیش لێدوانەکەی ئەویان بە هەڵەو ترسناك ناوبردبوو، بۆیەش ئەو یارمەتییەی کە بەهاکەی دەگەیشتە ١٢٠ هەزار یورۆ، کە لەلایەن وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسی پێشکەشیان کراوە، داوا دەکەن بگەڕێتەوەو قبوولی ناکەن، کە بۆ یارمەتی و دەستگرتنی نەشتەرگەری بریندارەکانی کەرتی غەزە ناردبوویان.

زۆر خۆم بە سەردەمی منداڵی و هەرزەکاری برنار کۆشنێر ماندوو نەکرد، هەر ئەوەندە بەسە کە بە خوێنەرەکانم بڵێم، کە بریتیە لە چەند زانیارییەك لەسەر سەردەمی گەنجی ئەو پیاوە. ماوەی بیست ساڵ ئەو پیاوە بە ڕامان و هزری شیوعییەتەوە کەرەستەی دژایەتی دەسەڵاتی کۆکردیتەوە، پاشان شەرە بیست ساڵییەکەی لەگەڵ دەسەڵات وەلاناوەو لەگەڵ لۆژیکی دەوڵەت ئاوێتەبووەو لەوێیەوە توانیویەتی کاروانی سیاسییەکەی خۆی بنیات بنێت. لە ساڵی ١٩٨٨ بەتایبەتی بۆ ڕۆژنامەنووس (جۆن فرانسوا دۆڤال) هەڤپەیڤینێکی دوورودرێژی کردووەو لەوێ جوولەکەییە دوولایەنییەکەی

خۆی سەڵماندووە. ئەو لەوێدا وتوویەتی کەوا ئەو نیو جوولەکەیە، ئەوەش مانای ئەوەیە ئەو دووجار جوولەکە؛ ئەوەش دەگەڕا پێگەیەکی سەرەکی بۆ چالاکییەکانی بدۆزێتەوە. لەو دیمانەیەدا هۆکارەکانی سەرقاڵبوونەکەی ئەو بە شکستەکان جوولەکەی بۆ (جۆن فرانسوا دۆڤال) روون نەکردیتەوە، بەڵام وتوویەتی:

(لە تەمەنی هەرزەکارییمدا، خۆم بە جوولەکەو مردنی جوولەکان سەرقاڵ کردبوو، ئەوان چۆن دەیانتوانی ئەوەندەو بەو شێوەیە بچەوسێنەوە...؟ من زۆر دەمگوتەوە، نابێ مەردووم هەرگیز بچەوسێندرێتەوەو ئەوەندەش گوێرایەڵ بێت).

## هۆرمۆنی نێرینەی

ئەو لەو دیمانەیەدا وتوویەتی:

(هەموو کەسێك لە ئێمە وا هزر دەکات کەوا ئەو سەردەکەوێت و بەرامبەرەکەی دەشکێنێت، جۆرەها شێوەکانی ئازاردان و ئەشکەنجەدان بەکاردەهێنێت، وەك ئەوەی لە ژنەکەی خۆی دەدات، بەرووی هاوسێیەکەیاندا هاواردەکات، یان ئازاری ئەوولاو ئەولای خۆی دەدات، هەمووش ئەوانە بۆ ئەوەیە تا لەبیر خۆماندا ببینەوە، کەوا ئێمە رۆژێکیان هەر دەمرین، هەرچەندە جولاینەوەو بزاومانکرد وا هەستدەکەین ئێمە گرینگ و نەمرین).

دەکرێ ئەو بۆچوون و رامانەی ئەو لەو دیمانەیەدا بۆ تێگەیشتن لە ئیلتزامکردنی کۆشنێر لە خەباتی لە پێناوی کەمینەکان و قوربانییەکان بگێڕینەوە سەر تەفسیری گەورەی جیهان ئەویش بوونی هۆرمۆنی نێرینەیە. ئەو ترسناکی خۆشویستوەو هەستیکردووە بوونی هەیە، ئەوەش زۆرتر

هەستی پێدەکات کە لە بیاڤرا بووە، یان لە تشادو ئەفغانستان، ئەو وتوویەتی: (هەموو کارێك لە کاتی ترس یان لە هەستکردن بە ترس گرینگ و زۆر بایەخداردەبێت).

ئەو لە پاش براڤیادا، لەگەڵ کوردەکان لەگەڵ کریستیانە لوبنانییەکان و ئەریتریەکان و کەسەکانی توتسی رواندا و یاخیبووەکانی خوارووی سودان و پاشان دانیشتووانانی دارفۆرو هەروەها لە کۆسۆفۆشدا قسەیەی کردووە. کۆشنێر بووە بە پەیڤداری رەسمی شەڕە سیاسییە سەربازییەکان، ئێستاش کاری زۆت ناشیرین و بژارکراوی دوور لە شرۆڤەی لۆژیکی و واقیعی رەوشەکان دەکات.

## میدیا لەخزمەت کۆشنێردا

ئەو بەردەوام لە کێشەو قەیرانە دەوڵییەکاندا لایەنێك بوو، دەبێ ئێمە ئەوەش بڵێین ئەو کێشەو ئەو شەڕانەی لە ماوەیەکی زۆر ئەو سەرقاڵییان بووە، هەموویان کێشەو شەڕی واشنتۆن بوون، هەمان ئەو کێشانەیە کەوا ژمارەیەك لە کەسانی روناکبیرو هزرمەندی نزیك لە بۆچوونەکانی ئەمریکا بەرگری لێوە دەکەن. زۆر لە بەرژەوندییەکانی کۆشنێر بە روونی دیارە وەك پشتیوانیکردنی لە (عزت بیگوفیتش) لە بۆسنەو کۆسۆفۆییەکان دژ بە سربییەکان و یاخیبووەکانی توتسی لە رواندا و (جۆن گرنگ) لە خوارووی سودان و خەڵکی دارفۆر، هەروەها پشتیوانیکردنی شەڕەکەی ئەمریکا لە عێراقدا. ئەوەیە بۆچونی کۆشنێر لە جیهاندا، ئەوەش لەگەڵ بنچینە سەرەکییەکانی رەووشت، دابڕانێکی ترسناکە. لەودەمانەی و پاش ئەوەی (کریستین نوکرانت)ی هاوسەری دەبێتە بەرێوبەری گشتی راگەیاندنی دەرەوە _ بینراوو بیستراو _ ی فەرەنسا، ناوەکەی دەگۆڕێت بە دەنگی فەرەنسا.

ئەو کە دانیٚ بەوەدا نابوو کەوٲ ئەو لەگەڵ بەربەرەکانێی بەرژەوندییەکانە هەمووڵایەك شۆك بوون، کە بۆ فرانس ئانتر وتبووی:

(من یەکەم کەسم ئیعتراف بە بەربەرەکانێی بەرژەوندییەکان دەکەم، من بە هیچ شێوەیەك دەست لە کاروباری راگەیاندنی بیستراوو بینراوی دەرەوە وەرنادەم، بۆ ئەوەیان سوێند دەخۆم).

* * * *

٢

# بۆنی پترۆڵەکەی بیافرا لیکاوی ئەو دەهێنێتە خوارێ

لە ژێر چەتری لیژنەی دەوڵی خاچی سوور چل ساڵ پێش ئێستا، دەستەیەك لە دکتۆرە گەنجەکان، لەوانە برنار کۆشنێر بۆ کارێکی مرۆڤدۆستانە روو لە هەرێمی بیافرای نایجیریی دەکەن. کۆشنێر وەك یەکێك لە دامەزرێنەرانی دەستەکە دەڵێت:

(بیرۆکەی ئەو دەستەیە لە بیافراو لە مانگی ئوکتۆبەری ساڵی ١٩٦٨ دروست بوو، پاشان شیرازەی ئەو دەستە دکتۆرە دەبێتە ناوکی رێکخراوی پزیشکانی بیٚ سنوور).

بەڵام ئەو قسانەی کۆشنێر دەیگێڕێتەوە دوورە لە راستی، بۆیە دەبیٚ زانینی راستییەکانی سەفەرەکەی وەزیری دەرەوەی فەرەنسی بۆ بیافرا زۆر بایەخداربێت، ئەوەی روویداوە بوار ئاسان دەکات لەراستی نمونەکەی بیافرا بگەین، کە کۆشش دەکەین هێڵەکانی رەنگ بکەین، وەك لە خوارەوە دەینووسینەوە:

لەبەر چەندین هۆکار هێزێکی خۆرئاوایی پشتیوانی لە کەمینەیەکی ئەو وڵاتە دەکات، کە لەلایەن دەسەڵاتدارانی وڵاتەکەیان دەچەوسێندرێنەوە، بۆیە ئەو لایەنە ناچاردەبن خزمەتگوزاری و یارمەتی پێشکەش بە قوربانییەکان بکەن، هاوشانی ئەو یارمەتیدانەش هەڵمەتێکی بەرفراوانی گشتگیریان لەگەڵدایە کە مەبەستیان زۆرتر روونکردنەوەی دیمەنەکەیە لەسەر بابەت و پێشهاتەکە. بەڵام مەبەستی سەرەکی و شاراوەی یارمەتیەکە کاریگەری لەسەر رای گشتی، بە ناردنی چەند زانیارییەکی چەواشەو دوور لەراستی لەسەر رووداوەکان و بەربەرەکانێیەکان دەبێت، دیارە خەڵکە چاکەکەش دەبوونە قوربانی ئەو گەمەیە. زۆر جار لە ناو رۆژانەی بەربەرەکانێیەکانیشیدا دەستەواژەی قرکردن بەکارهاتووە، بۆ حاڵی بوون لە بەشی زۆری ئالیەتیەکە، وا باشە بگەڕێینەوە سەرچاوەکان و کاریگەرییە راستەقینەکان. (ئان ڤالاییز) لە کتێبە گەورەکەی بەناوی (دکتۆرە بێ سنوورەکان، بەسەرهات و گێڕانەوەکە)دا، لەکاتی تیشک خستنە سەر رووداوەکە، زۆر باس لە خاڵە تەژی لە تراژیدیاکان دەکات کە لە بیافرا قەوماون.

## هەڵگیرسانی شەڕە ناوخۆییەکە

نایجیریا لە ئوکتۆبەری ساڵی ١٩٦٠ سەربەرخۆیی بەدەست دەهێنێت، ئەو وڵاتە دەکەوێتە سەر کەنداوی غینیاو ئەندامیش بووە لە رێکخراوی کۆمۆنوێلس، سەرەتا ئەو وڵاتە دەبێتە سێ هەرێم، بەڵام لە ئەنجامی بەردەوامی ناکۆکییەکان و نەبوونی نارامی، وڵاتەکە دابەش دەبێتە سەر ١٢ هەرێم. کە کودەتاکان زۆر دەبن، کە کوشتنەکان بەردەوام دەبن کێشەو ئالۆزی زۆری دێتە پێشەوە، بۆیەش بەناچاری حاکمی وڵایەتی بیافرا (ئودیمغو ئیمیکا ئوجوکو) لە رۆژی ٣٠ی مایۆی ساڵی ١٩٦٧دا

سەربەخۆیی وڵایەتەکەی رادەگەیێنێت، ئەوەی شایانی باسە ئەو وڵایەتە بە پترۆڵ دەوڵەمەندەو دانیشتوانی سەر بە عەشیرەتی (ئایبو)ن، ناویش لە وڵایەتە نوێیەکەیان دەنێنن، کۆماری بیافرا و شاری ئاینیگۆش دەکەنە پایتەخت. کە حکومەتی ناوەندی لە لاگۆس لە سەرچاوە سروشتییەکان و دەسکەوتەکان بێ بەش دەبێت زۆر چاوەڕوان ناکات، بۆیە هەر زوو هێرش دەکاتە سەر وڵایەتەکە، کە لەوەدەمانەدا لە سانفرانسیسکۆ لە یولیۆی ساڵی ١٩٦٧ سەرقاڵی ئاهەنگەکانی هاوینی ئەڤین بوو، شەڕی ناوخۆ لەو وڵاتە ئەفریقییەدا هەڵدەگیرسێت.

دیارە کەوا راگەیاندنی سەربەخۆیی بیافرا مەسەلەیەکی ناوخۆیی نایجیری نەبووە، چونکە هەر یەك لە دیکتاتۆری ئەسپانی فرانسیسکۆ فرانکۆو دیکتاتۆری پرتوگاڵی سالازارو ژەنراڵی فەرەنسی دیگۆل پشتیوانیان دەکرد. وڵاتە هێزدارە کۆلۆنییەکانی کۆن رۆڵی وڵاتی نایجیریان قبوول نەبوو، کە فەرەنسییەکان لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٠ لە بیاناندا خەریکی تاقیکردنەوە ناوەکییەکانی خۆیان بوون، هەڵوێستەکانی لاگۆسیان بەدڵ نەبوو. لەوەدەمانەدا لاگۆس پەیوەندییە دبلۆماسییەکانی لەگەڵ پاریس دەبڕێت، بوونی ئەو ساردییەو سەرهەڵدانی ئەو پێشهاتە بیانوو خۆش دەکات رەوشی فیدراڵی نایجیریا شپرزە ببێت، هەروەها دەسەڵاتداری ئالیزێ هەستیکردبوو کەوا ئەفریقیای زەبلاح هاوکێشەکانی ئەفریقیای خۆرهەڵاتی هەژاندبوو بەتایبەتی نیشتەجێیە پارێزراوە فەرەنسییەکانی ئەو بەشە. سەرۆك (کودیفور فیلیکس هوفویی بوانیی) لەگەڵ ئالیزێ هاوسۆزەو وا دەزانێت نایجیریا بووە بە کابوس، بۆیەش لەگەڵ (جاك فوکار)دا هاوپەیمانییەتی مۆر دەکات، ئەو پیاوە بەهێزەی دیگۆلییەکان بە (گەورەی ئەفریقیا) ناوی دەبەن. لەنێوان ئەو پیاوەدا بڕیاری تایبەتی دەردەکرێت بۆ ناردنی یارمەتییە نهێنییەکان بۆ جوداخوازەکانی بیافرا.

# بۆنی پترۆڵ

بۆنی پترۆڵ دوور نەبووە لەوەی فەرەنسییەکان پشتیوانی لە ئوجوکو بکەن، چونکە بیاڤرا بەو کانزا زێرینە رەشە دەوڵەمەندبوو، کە یارمەتی نوجوکو دراوە واتە کۆمپانیای (شال)ی هۆلەندی لە مەودایەکی دووردا زیانبەخش دەبێت، لەولاشەوە لاگۆس لەلایەن وڵاتانی تری (ئی ئیل ئیف) یارمەتی هەیەو لەلایەن کۆمپانیای نیشتیمانی فەرەنسیش پێگەی خۆی هەیەو لەگەڵ وڵاتانی وەك بریتانیاو یەکێتی سۆڤیەت و وڵایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش پشتیوانی هەبوو. لە کاتی شەڕی ساردەوە پاش هاتنە پێشەوەی چەند هەڵەیەك هەر یەك لە سۆڤیەتییەکان و بریتانییەکان کۆششیان دەکرد کۆنترۆڵی سەر ئەفریقیا بکەن، سۆڤیەتییەکان فڕۆکەی مێك و ڕەشاشیان رەوانە دەکردو لەولاشەوە بریتانییەکان پاراستنی ئاسایشی ناوچەکەیان دابین دەکرد، ئەوان بوون بە هۆی هەردوو کۆمپانیا (بریتش پترۆڵیوم)و (یونیلیفر) قۆرخی مەسەلەکەیان کردبوو. لەودەمانەدا فەرەنسییەکان لەناو وڵاتە کۆلۆنیاییەکانی پێشوویان کاریگەرییان هەر مابوو، گۆمانیش نییەو ناکرێ ئەوە پشت گوێ بخرێت، کەوا کاریگەری فەرەنسی لەسەر ئەفریقیا هەتا ئیمڕۆش هەر ماوەو نکۆڵی لەوەش ناکرێت. (جاك فوکار) رۆڵی لە لێکترازانەکەدا هەبوو، ئەو پرۆسەکەی بەچەك سازدەکردو لایەنە نهێنییەکانی مەشقدار دەکرد، هەر ئەویش بوو رێکخراوی خاچی سووری نێونەتەوەیی رەوانەی بیاڤرا کردبوو. ئایا بەبێ ئەو پیاوە کۆشنێرو هاوڕێیەکانی بۆیان نەدەکرا بگەنە ئەو ناوچەیە...؟ ئایا پێش گەیشتنی ئەو گەنجە دکتۆرە، ئەوەی باش دەزانی کەوا ئەو سەربازێکی گچکەی تۆڕەکانی کاریگەریی فەرەنسییە لە ئەفریقیا..؟

# شەڕی پترۆڵ

لە دیمانەیەکدا کۆشنێر لە ساڵی ٢٠٠٣دا لەگەڵ ئان ڤالییزدا، ئەو وتبووی: (من هیچم لەسەر بیافرا نەدەزانی، بەڵام دەمزانی شەڕەکە شەڕی پترۆڵە، ئەویش وەك کەسە دەبەنگەکان ئاگاداری هیچ نەبووەو زانیاری لەسەر ئەو مەسەلانە نەبووە). لە رۆژانی سەرەتای راگەیاندنی سەربەخۆییەکەی ئوجوکو رۆڵی فەرەنسا لەو مەیدانەدا هەستی پێکراوە، رۆژنامەی لۆمۆندی رۆژی ١٧ی یولیۆی ساڵی ١٩٦٧دا بەیانێکی سەفارەتی ئەمریکی لە لاگۆس بڵاوکردیتەوە کە تێدا هاتبوو، کەوا سوپای فەرەنسی چەکیان بە یاخیبووەکان داوە، لەوانە فڕۆکەی جەنگی جۆری بی ٢٦یان بۆیان رەوانە کردووە، ئەو فڕۆکانە بەشێوەیەکی ناشەرعی و بەدەستی تاقمێکی فەرەنسی گەیشتووتە ولایەتی نایتوگو. ئەمریکییەکان وتبوویان ئەو فڕۆکانە لە لشبونەو دکارو ئابیجان نیشتوون، بەڵام فەرەنسییەکان ئەو قسانەیان بە هەڵبەستراو ناوبردبوو، رایانگەیاندبوو کەوا پاریس بەهیچ شێوەیەك دەستی لە ناو کاروباری ناوخۆیی ئەو هەرێمە وەرنەداوە. رۆژنامەی لۆکانار ئونشینی نووسیبووی تەنها پاریس رۆڵی نەبووە لەناردنی فڕۆکەکان و یارمەتی یاخیبووەکان، بەڵکو شۆرشیان لەسەر جاك فۆکاری سکرتێری گشتی رەوەندەکانیان لە ئالیزێیش کردووە.کۆشنێر لە ساڵی ١٩٦٨ خوێندنی پسپۆری لە نەخۆشییەکانی هەناو لە نەخۆشخانەی کۆشین تەواو دەکات، لەبەر سەرقاڵی زۆری ئەو بە خوێندن ئەو بەشداری بزاڤی مایۆش بە هیچ شێوەیەك ناکات، کە لەو ساڵەدا دامەزرابوو. ئەو کەسی یەکەم بوو لەو دەستەیەی لە ٣ی سپتەمبەر بەرەو بیافرا دەفڕێت، تیمەکە بێجگە لە کۆشنێر، هەردوو خوێندکاری کۆلیژی پزیشکی ساڵی چوارەم، (ئولیفیی دۆلاك)و (جۆن فرانسوا بارنودان)ی لەگەڵدابووە، لەگەڵ وەفدەکەش کەسێکی کارکەری برینپێچیان بەناوی (فرانسیس دوشارتیر)یان هاوشان بووە.

## ئەو یەکەم کەس بووە بانگەوازەکەی قبوول بووە

تیمەکــە لەســەر داوای دکتــۆر (مــاکس ریکــامیی)ی پــسپۆر لــە نەخۆشییەکانی لووت و گەرووی ناسراو بە کارگوزاری خـەیری زۆر لـە بـوارە خەیرییە مرۆڤدۆستانەکانەوە دامەزراوە. ماکس ریکامیی دەڵێت: (کۆشنێر یەکەم کەس بووە، کە بانگەوازەکەی قبوول بووە، من ئـەوم نـاس نـەدەکرد، زووتر یەکجاری ترم دیبوو، ئەویش لە سالۆنەکانی نەخۆشخانەی کۆشین بوو، ئــەو گــەنجێکی قۆزبــوو، هێــشتا تێــزی دەرچــوونەکەی خــۆی نــمایش نەکردبوو).بەڵێ وابوو ئـەو هێشتا نامەکـەی پێشکەش نـەکردبوو، کـە لـە بیافرا گەڕاوەتەوە نامەکەی پێشکەش دەکات، کە بابەتی نامەکەی ئـەوەبوو (کاردانەوەکانی بەهانا هاتنە مرۆڤایەتیەکان لە بیافرادا).

لە نێوان سپتەمبەری ساڵی ١٩٦٨ەوە تا ینایری سـاڵی ١٩٧٠ نزیکـەی ٥٠ کەسی خۆبەختکەر لە خاچی سووری فەرەنـسی لـە هەڵمەتەکـەی بیـافرا بەشداربوون، بێجگە لەو فەرەنسیانە ١٧٠ کەسی ئەورووپی لەوانە ٧٠ کەسی سویدی و ١٠٠ کەسـیان سویـسری بـوون، هـەموویان لـەژێر چـەتری لیژنـەی دەوڵی خاچی سوور کارکەربوون. کۆشنێر لە نێوان سپتەمبەر تا ئوکتۆبـەری ساڵی ١٩٦٨ سێ جـار بەشـداری کـردووە، دووبـارە لـە دیـسمبەری هـەمان سـاڵدا، بەشـداربوودو دواجـاریش لـە نۆڤمبـەری سـاڵی ١٩٦٩دا سـەردانی بیافرای کردووە. ئـەوەی شـایانی باسـە کـارو بەرنامـەی رێکخـراوی خاچـی سووری دەوڵی پێشکەشکردنی یارمـەتی و خزمـەتگوزاری مرۆڤایەتییـە بـۆ کەســانی پێویــست و لێقــەوماوەکان لــە کــاتی جــەنگ و لــە ناوچــەی کارەساتەکان، لە کاتی روودانی ملمڵانێ. ئەوەی دەبێ بزانـدرێت ئـەو کـارە مرۆڤایەتیانە بێ رەزامەندی حکومەت ناکرێت، پێشەکی دەبـێ حکومـەت رەزامەندی لەسەر هەبێت. دامەزراندنی سەرۆکی خاچی سووری فەرەنسی لە دەسەڵاتی سەرۆك کۆمارە، چونکە ئەو پۆستە زۆر هەستیارەو پەیوەنـدی بـە سیادەی دەوڵەتەوە هەیە.

# هەڕەشەکانی لاگۆس و فەرمانەکانی دیگۆل

لیژنـەی دەوڵـی خاچـی سـوور زۆر کۆشـشی کردبـوو بـە شـێوەیەکی مرۆڤدۆستانە بەشداری خزمەتگوزاری بکات، بەڵام حکومەتی لاگوس بواری نەدابوو، هەڕەشـەیان کردبـوو هـەر فڕۆکەیـەکی بێگانـە بێتـە سـەر ئاسمـانی وڵاتەکەیان کە شەڕی تێدابێت، ئەوان ئاگربارانی دەکەن.

کە ڕەوشەکە ئاڵۆزدەبێت و ناوچەکە گڕدەگرێت، لیژنـەی دەوڵـی خاچـی سـوور بڕیـاردەدات مـل لـە ئاگرەکـە بنێـت و بـچێتە ژوورەوەو دەسـتەیەك دکتۆرو برینپێچ، لەگەڵ ژمارەیەك ئوتومبێل و میکـانیکی بـێ ڕەزامەنـدی حکومەتەکەیان بچێتە ناوچەکە، بەڵام خاچی سووری فەرەنسی لەبەر ئـەوەی کەرەستەکانیان سـازو ئامادەنـەبوو، لەبەرئـەوەی پێداویـستیە پزیـشکەکانی تەواو نەبوون ڕەوشی خراپ بوو. ژەنراڵ دیگۆل بڕیاردەدات بە زۆر بچێتە ناو بیافراو سیاسەتەکەی جێبەجێ بکات و نەگەڕێتەوە، لـە ڕۆژی ١٧ی یولیـۆی ساڵی ١٩٦٨ بانگی (جاك فوکار) دەکات ئەو پەیامەی پێرادەگەێنێت:

(دەبێ بەزووترین کات و زۆر بەپەلە یارمەتیەکانی بە هۆی خاچی سوور ڕەوانەی بیافرا بکەین).

بۆیە بە سەرۆکایەتی ماکس ریکامیی تیمێك لـە پزیـشکانی فەرەنـسی ڕەوانەی بیافرا دەکرێت، کە تیمەکـە دەگەنـە ناوچـەکە سەرسـام دەبـن، کـە دەبینن لەناوچەکە هیچ نیشانەیەك بەدی ناکەن کە ناوچەکە شـەڕی نـاوخۆی تێدا بێت. بۆیە ماکس ریکامیی دەڵێت:

(جانتاکانمـان لەسـەر شـان بـوو، کـە گەیـشتینە ئەوێنـدەرێ، کـۆڵی دەرمانمان هەڵگرتبوو، جۆرەها دەرمانمان پێبـوو، ئێمـە واماندەزانی لەپـەنا دارخورماکـان برینـدارەکان تیماردەکـەین، بـەڵام لەراسـتییدا ڕێـك بەپێچەوانەبوو).

که میللەتی ئایبو تیمە پزیشکەکە دەبینن سەرسام دەبن، دیاربوو میللەتەکە رۆشنبیرو رێکخراوبوون، ئەوان دووربوون لەو بۆچوونەی لەسەر ئەفریقیایەکان هەبوون، ئەو میللەتە لەگەڵ رۆژە سەختەکان راهاتبوون. فەرەنسییەکان بۆ گیرسانەوە وریاو چالاك بوون، لە ئۆردوگای (ئاوو ئاوماما) دامەزران، ئەوەش بە زمانی ئایبو مانای (دارە پیرۆزەکە)بوو، مەڵبەندەکە تەنها ١٥ کیلومەتر لە بەرەی شەڕەکان دووربوو. مەڵبەندەکە بۆ وەرگرتنی ١٠٠ نەخۆش سازکرابوو، بەڵام ٤٠٠ نەخۆشیان وەرگرتبوو، بە گوێرەی ردوشەکەو بارە گشتییەکە خاوێنی و باری دەسکارییەکان و هاتنە ژوورەوە باش بوو، شەوانە بریندارەکان بە لۆری یان پاسکیل دەگەیشتنە مەڵبەندەکە، زۆریش بە پشتی پیاوەکان دەگەیشتن.

## گەیشتن بە بیاڤرا

که برنار کۆشنێر دەگاتە بیاڤرا تازە (ئالبیر برنار بونگو) ببووە سەرۆکی گابون، دوو مانگ بوو ئەو ئیتلزامی بە کێشەی هاوڵاتیانی بیاڤرا راگەیاندبوو. ئەو (فۆکار فیلیب لیترۆن)ی کردبووە راوێژکاری خۆی لە لیبروفیل، هەر ئەویشی کردبووە بەرپرسی سەرپەرشتی چالاکییە نهێنییەکان. لە هاوینی ساڵی ١٩٦٨دا پایتەختی گابۆن ببووە بنکەی پشتەوەی ئەو یارمەتیانەی رەوانەی ئوجوکۆ دەکران. بەقسەی سەربازێك بەناوی (رۆڵف ستیز) یەکەمین فڕۆکەی فەرەنسی کە بەباری یارمەتییەوە لە (یولی) بیاڤرا نیشتەوە لە گابۆنەوە هەڵسابوو، شەوانە لە فڕۆکەخانەی لیبروفیلەوە ئەو فڕۆکانە هەڵدەستان، بەڵام بروسکەیەك لە وەکالەتی ئوسوشیتد پرێس لە سەرەتای مانگی ئوکتۆبەر بڵاوکرایەوە، تێدا ئاماژە بەوە کراوە کەوا شەوانە لە پایتەختی گابۆنەوە فڕۆکەکان چەکیان گەیاندووتە

بیاڤرا، بەڵام زانیارییە ڕەسمییەکان دەیانووت کەوا ئەوەی ئەوان دەگاتە بیاڤرا هەمووی ئازوخەبوون، ئەو پارمەتیانەش هەموو لەژێر چاودێری تیمێکی خاچی سوور دەگەیشتنە بیاڤرا. خاچی سوور سەرپەرشتی ناردنی دەرمانەکانی دەکرد بۆ بیاڤرا، ئەوان ئاگادارنەبوون لە دوورەوە ئەو کارتۆنە گەورانە چی تێدا کە باردەکران، بەدڵنیاییەوە دەیانزانی شیری تۆز نییە، زۆریشی نەخایاند مەسەلەکان گۆڕان (کۆلۆنیل مارل)ی ڕاوێژکاری سەربازی سەفارەتی فەرەنسی لە گابۆن کرابووە بەرپرسی خاچی سووری فەرەنسیش، بۆیەش شتەکان تێکەڵ دەبوون، ڕاستییەکان دەشێوێندران. برنار کۆشنێرو هاوڕێیەکانی بەو فڕۆکانەش هاتوچۆیان کردووە کە باری چەکیان هەڵگرتووە، بۆیەش ئەو ڕۆژانە بەو شێوەیە باسی کاری دوولایەنی پزیشکانی خاچی سووریان کردووە: (ڕەوشەکان بۆ ئێمە زۆر باش نەبوون، ئێمە بەوەش دڵمان خۆش نەبوو، ئێمە زۆر ڕقمان لەو جۆرە هەڵسوکەوتانە هەڵدەستا).

ئایا بەئاشکراو بەراشکاوی برنار کۆشنێر لەگەڵ هاوڵاتیانی بیاڤرا نەبوو...؟ ئایا ئەویش داوای ئەو چەکانەی نەدەکرد...؟

ئیمڕۆ کۆشنێر وا دەزانێت کەوا بەو شێوە دەکرا کارەکانمان ڕاپەڕێنین، وا نەبووایە نەدەکرا گیانی بریندارەکان ڕزگار بکەین، مانەوەمان بە بوونی دەنگۆیەکی ڕاگەیاندنەوە بەندبوو. ئەو جۆرە ڕەوشتە ببووە نیشانەیەکی بازرگانی، کە پاشان کۆشنێری پێ ناسرا.

ئەو لەودەمانە دەبووایە هاوار بکات، هەرایەك بنێتەوەو بڵێت کەوا نایجیرییەکان منداڵە بەستەزمانەکان دەکوژن، هاوڵاتیایە سڤیلەکان دەکوژن، کۆشنێر دەڵێت: (من ناچاربووم بگەڕێمەوە ژەنێڤ و لەوێ کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەگەری سازبکەم. بنکەی لۆجستی خاچی سووری سویدی لە سانتا ئیزابیل بوو، لەوێ فڕۆکەیەکم وەرگرت و بۆی دەرچووم، لەوێ بواریان نەدام لە پێش ڕای گشتی قسەبکەم، منیان ناچارکرد بگەڕێمەوە بیاڤرا).

# یاخیبوونی خاچی سوور

ئەگەرچی لەسەر ئەخۆشخانەکی نوکیگوی ئاڵای خاچی سووریش هەڵدرابوو، ڕۆژێکیان هێرشێکی چەکدارانە دەکرێتە سەر ئەخۆشخانەکەو تێدا چوار کەس دەکوژرێت لەوانە دوویان پزیشك و دووەکەی تریش پیاوانی کریستیانخوازبوون، هەر لەو هێرشەدا دوو کەسیش بە سەختی بریندار دەبن. لەو ڕۆژەوە ئاستی پاراستن و پارێزگاریکردن لە تیمەکانی ڕێکخراوە خێرخوازەکان کەم دەبێتەوەو مەترسییەکان لە بیافرا لە سەریاندا زۆر دەبێت، بۆیەش کەسە گیانبەختکەرەکان نیگەران و بێزاردەبن، هەموو لایەك داوای سەلامەتی و پاراستنی گیانیان دەکرد، گوشارەکە لە ناو بارەگای لیژنەی دەولی خاچی سوور گەشەدەکات، ئەوەش پاش ڕووداوەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی و بۆ یەکەمجار کارمەندانی خاچی سووری دەولی هەڕەشەیان لێبکرێت و لە مەیدانەکانی کاردا یاخی دەبن و ناڕەزاییەکان توند دەبێت. لەسەر ئەو بابەتە کۆشنێر دەڵێت:

(خەمبارین بۆ ئەوانەی بوونە قوربانی، ئێمە لەسەر حەق بووین، دەبووایە قسە بکەین و ئەو مەترسییانە بەرای گشتی دەولی ڕابگەیێنین، کە ڕووداوی کوشتن ڕوویدا نەدەبووایە گوێ بدەینە کارە بیروکراتییەکانی خاچی سوور، کە ئاگرمان بەرووودا دەتەقێندرایەوە ئەوان بێدەنگ بوون، نەدەبووایە ڕێکخراوەکە لەوەدەمانەدا دەستەوەستان بوەستن).

٣

# کۆشنێر لە پزیشکانی بێ سنوورەوە بۆ پزیشکانی جیهان لەوێشەوە بۆ وەزارەت

پاش ئەوەی دکتۆر برنار کۆشنێرو دکتۆر ریکامیی زۆر بەرگە دەگرن و هەناسەیان درێژبوو، زۆریش لەسەر بێدەنگبوونیان لەسەر خاچی سوور رادەوەستن، لە کۆتاییدا بڕیار دەدەن ئاگایی خۆیان لە کارەکان بڵاوبکەنەوە، ئەوەبوو پاش ١٥ رۆژ لە سەر لاپەرەکانی رۆژنامەی لۆمۆندی رۆژی ٢٨ی ئوکتۆبەر ساڵی ١٩٦٨ روونکردنەوەیەك بڵاودەکەنەوە. خاچی سووری فەرەنسی لە کۆبوونەوەی ساڵانەی خۆیداو لە رۆژی ٢٤ی نۆڤمبەری ساڵی ١٩٦٩دا ئەندامانی تیمەکەیان لە پیاڤرا رێز دەگرن، لەبەرئەوەی زۆر لە برنار کۆشنێر تووڕەن، بۆیە ناوەکەی ئەو لە رێزگرتنەکە دەردەهێنن. ئەوەش بەروونی و باشتر لە وەڵامی پرسیارێك لە رۆژنامەیەك کە لە لیبروفیلی پایتەختی گابون بەناوی (فراتارنیتی ماتان) دەردەچێت ئاماژەی پێدرابوو، تێیدا رۆژنامەنووسێك کە ناسنامەکەی خۆی ئاشکرا نەکردبوو، هەر ئەوەندەی نووسیبوو کەوا کەسەکە دکتۆر (ك) پزیشکێکی گەنجەو لە قۆناخی ساڵی پێنجەمیەتی لە کۆلیژی پزیشکییدا.

## بێلایەنیەکی نەگونجاو

دیارە کەوا کۆشنێر هەموو راستییەکان بڵاودەکاتەوەو ئەوەی دەیزانی دەیڵێت، بەڵام ناوی خۆی نەنووسیوە، لەوێدا بێلایەنی لیژنەی خاچی سووری فەرەنسی لە بەرنامەو کارە خێرییەکانی رەتدەکاتەوەو نووسیویەتی:

(دەبێ رۆژێك لە رۆژان سەباردت بەبێلایەنی هەڵوێستی خاچی سووری دەوڵی لەکارنامەکانی خۆیاندا بچنەوە، لێژنەکە لەگەڵ رەوشەکانی ئەفریقیا نەدەگونجا، رەنگە لەگەڵ رەوشی ئێستای جیهانیش نەگونجێت).

لە وتارەکەیدا برنار کۆشنێر بەردەوامەو نووسیویەتی:

(ئەگەر هاوڵاتیانی بیافرا خۆیان چەکی خۆیان هەبووایە دەیانتوانی نەخۆشخانەکان بپارێزن، بەوەش بریندارەکان گیانی خۆیان دەپاراست، سەیر بکەن دیارە کەوا نایجیرییەکان رێز لە رێکەوتنامەی ژەنێفی تایبەت بە خاچی سوور بۆ بریندارەکان و بۆ کارمەندی نەخۆشخانەکان ناگرن، دەبێ چاو بەو رێکەوتنامەیە بخشێنین، ئەوەش لە رووی مرۆڤایەتی و سەربازییەوە بانگەوازێکە بۆ نیتلزامکردن بە یارمەتیدانی خەڵکی بیافرا).

دکتۆر (باسکال غربلتی یوسفیال) ئەوەی تیمی دووەمی پزیشکانی فەرەنسی بەرێوەدەبردو یەکێك بوو لەو دوازدە دکتۆرەی رێکخراوەکەیان دامەزراندووە، دەڵێت:

(لەناخەوە لەگەڵ بیافرا هاوسۆزبووین، من لە هەموویان زۆرتر سۆزداریان بووم، لەوبەری نایجیریاش تیمی تر هەبوون، ئەوان هاورێیە سویدییەکانمان بوون، ئەوانیش کارکەربوون، من ئەودەمانە ویژدانم ئارام بوو، وەك چۆن حکومەتەکەمان لەو کیشەیەدا دەستی هەبوو، بەڵام کەس لە ئێمە کەسی لایەنگیر نەبوو، ئێمە چاوەڕوانی ئەو یارمەتیانەمان دەکرد کە شەوانە لە لیبروفیلی گابۆنەوە دەگەیشتە لامان، زۆریش دەمانپرسی بۆچی کاری زۆرتر ناکەن...؟ ببوورن من ئێستا وەك دکتۆرێك دیارنیم، من دەمپرسی بۆ زۆرتر یارمەتیەکان رەوانە ناکەن، هەروەها دەمانووت چەکیان بۆ دابین بکەن، بەوەش دەتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن).

❊ ❊ ❊

# هەڵمەتێکی ڕاگەیاندن لە بەرژەوەندی بیافرادا

بەدرێـــژایی ســـاڵی ١٩٦٩دا میـــدیای فەرەنـــسی تـــەژی لێـــدوان و بانگەوازبوو، هەڵمەتەکە بە روونی لە قازانجی بیافرابوو، کۆشـنێر لـە سـاڵی ١٩٦٨ لیژنەیـەکی بـۆ دژایـەتیکردنی قڕکـردن لـە بیـافرا دامەزرانـدبوو، کۆششی دەکرد نارەزاییەکان دژ بەو کـارە هۆڤیانـە بـەردەوام بێـت. کەواتـە کۆشنێر کەوتە ناو ئەو ستراتیژییە راگەیاندنە کە جاك فوکـار چوارچـیوەکەی دارشتبوو.

سـەبارەت بە رژێمی (ئوجوکو) کاتەکە ناسك بوو، چـونکە ململانێیەکـە قـاڵبێکی ئاینیـشی وەرگرتبـوو، فیدراڵییـەکان موسـلمان بـوو، ئـەوان لـە دەزگاکانی راگەیاندنەکانی خۆیاندا دەیـانگووت ئێمـە بیـافرا دەخەینـە بـەر ئـاینی ئیـسلام، لەولاشـەوە بیـافرا ولایـەتێکی کریـستیان بـوو، لـە زۆر کەنیسەکانی خۆرئاوا گەورەکان کۆمەك دەکراو یارمەتی دەگەیـشتێ، بـەڵام کەنیـسەکان چـەکیان دابـەش نـەدەکردو پێویـستییە گەورەکانیانیـشیان پـێ نەدەبەخشین.

بەو شێوەیە بەرپرسە بیافراییەکە (بادی داڤیس) باسی رەوشـی خۆیـانی کردبـوو، کـە وتبـووی: (بـەو شـێوەیە زاراوەی قڕکردنمـان داهێنـا، بـەوەش کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیمان لە ئازارو ژانەکانمان هوشیارکردەوە).

****

# برسیەتی دەگۆڕێت بە چەك

بەرژەوەندییە ئیستخبارتیەکانی فەرەنسی لە دەزگاکانی راگەیاندندا رۆڵێکی مەزنی بینیبوو لە گەیاندن و فۆرمەلەکردنی زانیارییەکان. وەك چۆن (داڤیس ببرد) دەگێڕێتەوە: (یەکەمجارە لە مێژووی جەنگدا برسیەتی کراوە بە چەکێك لە شەڕەکاندا).

لە مەیدانیشدا هەریەك لە (مارکبراس بیاڤران) یان (ئوفرسیا براس) مشووری رۆژنامەنووسەکانیان دەخوارد، لە دیدی ئەوانەوە بەرگری شەڕکەرەکان و قوربانی هاوڵاتیانیان دەبینی، بۆ ئاسانکردنی کاری رۆژنامەنوسان دەسەڵاتدارەکان بەیەکەوە کۆیان دەکردنەوە، سەدان کەس لەبەر برسیەتی دەمردن و چاوەڕوانی نیگای میدیاکانیان دەکرد، تا گیاندەرچوون و رۆحدانەکانیان ببینن و وێنەیان بگرن. لەودەمانەدا دەزگاکانی راگەیاندن سەرقاڵی دادگاییکردنی تاوانبارە نازییەکان بوون، لەوانە کێسی (ئیشمان)ی ساڵی ١٩٦١و کێسی (فرناکفۆرت)ی ساڵی ١٩٦٥. زۆریان کاردساتی بیاڤرایان بە کۆمەڵکوژیی جوولەکەش دەشوبهاند، تا وای لێهات دەزگاکانی راگەیاندن ئیبوویەکانیان بە جوولەکەی ئەفریقیا ناودەبرد. ئەوەی ئێستا ئێمە باسی دەکەین، لە چەندین لێدواندا باسکراوە، لەوانە لە تۆمارێکی بەڵگەنامەیی کە لەلایەن (جویل کالمات)ەوە بەرهەم هێنرابوو، هەست پێدەکرێت، کە زاراوەی قڕکردنیش تێدا بەکارهاتووە لەسەر داوای بەرژەوەندی ئیستخباراتی فەرەنسییەوە بووە. ئەوان داوایان لە هاوڕێیە ژوورنالیستەکانیان کردووە کەوا وشەی قڕکردن لە ناوەرۆکی راپۆرتەکانیان بەکاربهێنن، بۆیەش ئەو وشەیە لە هەموو جیهان دەنگ دەداتەوەو زۆرتر دەناسرێت. بەوەدش هەواڵەکانی بیاڤرا ببوونە سەروتاری سەرەکی هەموو ئاژانسەکانی هەواڵ لە جیهاندا.

## زاراوەی جینوساید

لـە سـپتەمبەری سـاڵی ١٩٦٩دا لیژنەکـەی برنـار کۆشـنێرو کۆمەڵـەی فەرەنسا _ بیاڤرا کە وەزیری پێشوو (رۆبرت بۆرن) سەرۆکایەتی دەکرد یـەك دەگرنـــەوە، ئەگەرچـــی لـــە دەرەوە زۆر کۆمـــەکی یاخیبووەکـــان درا، یاخیبوونەکـەی بیـاڤرا لـە ١٠ی ینـایری سـاڵی ١٩٧٠ کۆتـایی پـێ دێـت و هێزەکانی لاگۆس دەگەنە شاری یولی.

کۆشـنێر لـە سـتوونەکانی رۆژنامـەی لۆنۆفیلـدا کـە رۆژی ١٩ی ینـایرا دەرچووبوو رووداوەکەی بە هۆلۆکۆست ناوبردبوو، لەوێدا پرسیبووی:

(چۆن قبوول دەکرێت دوو ملیۆن کەس بکوژرێت...؟ دەزانن لە مێژووی هاوچەرخدا کۆمەڵکوژییەکەی بیاڤرا پاش کۆمەڵکوژی جوولەکەکان دێت).

لـەو لێدوانـەدا بۆمـان روون دەبێتـەوە کـەوا کۆشـنێر زووتـر بڕیـاری هەڵوێستێکی لەسەر ئەو پێشهاتانەی بیاڤرا دابوو، بۆ نمونە، پشتیوانیکردن لـە بـەرەی نیـشتیمانی روانـدی کـە (بـۆل کاگـام)ی دیکتـاتۆر سـەرۆکایەتی دەکرد. نان ڤالیس گوتوویەتی: (بیاڤرا بۆ کۆشنێر وەك ڤیێتنام وابوو).

لە کێشەو ئاڵۆزییـەکانی بیاڤرادا چەندین نیشانە دەرکـەوتن، یەکـەمیان دەسـتەواژەی قڕکـردن بـۆ پـشتیوانی میللـی پەیـدابوو، هـەروەها لایـەنی مرۆڤایـەتی و سـەربازییش تێکـەڵبوون، ئـەوەش بـواری سـازکرد پرۆسـەی دەستێوەردان بێتە ئاراوە. کۆشنێر پیاوی سەردەمەکە، باش لـە مەسـەلەکان تێگەیشتبوو، دەیزانی دەزگاکانی راگەیاندن چ رۆڵێك لەو مەیدانەدا دەبینن، زۆریش وریابوو لەوەی کـە هەرایەکـەی میـدیا چ دەخولقێنێـت. لـەو رۆژەوە کۆشـنێر فێربـوو ئـەو زانیـاری و چـالاکییە مرۆییـەکان لـە کـاری سیاسـی بەکاربهێنێت، بەوەش گەیشتە ئەوەی پۆستێکی وەزاری وەرگرێت، هـەر لـەو

ڕۆژەوە کۆشنێر ئامانجی بوو ببێتە کارەکتەری سەرەکی و دیاری ناو زوومی کامیراکان، چ لەژێر چەتری ڕێکخراوی پزیشکانی بێ سنوورەوە یان بە هۆی ڕێکخراوی پزیشکانی جیهانەوە، بۆیەش بەردەوام لە دەزگاکانی میدیا ئامادەیی هەبوو، بەردەوامیش باسی کارەساتەکانی کردووە، زۆریش ئازابووە لە تێوەگلاندنی دەزگاکانی دەوڵەت لەو ڕووداوانەدا.

## لەدایکبوونی ڕێکخراوی پزیشکانی بێ سنوور

ڕۆژنامەی پزیشك تونوس لە ڕۆژی ٢٣ی نۆڤمبەری ساڵی ١٩٧١دا بەناوی ڕۆژنامەنووس (فیلیب بارنیی)یەوە داوای لە هەموو پزیشکان کردبوو کۆبوونەوەیەك بکەن. ئەگەرچی داوەت و پەیامەکە زۆر ڕوون نەبوو، بەڵام هەموو ئاراستەی ڕووداوەکانی گۆڕیبوو، کە تێیدا هاتبوو: (داواکارین دکتۆرە فەرەنسییەکان ئەوانەی خۆبەختەکەری فریاکەوتنن، ڕێکخراوێك بۆ خۆیان و ڕاپەڕاندنی کارەکانیان دامەزرێنن).جاك بیریس کە یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی ڕێکخراوی پزیشکانی بێ سنوور دەگێڕێتەوە کەوا:
(پەیامەکە دیارو ڕوون نەبوو، بەڵام هەستێکی تایبەتی تێدابوو، ئێمە ویستمان دکتۆرەکانی بیاڤرا بەیەکەوە کۆبکەینەوەو ئەوانە بکەینە ناوکی ڕێکخراوەکە، ئیشەکەمان لەوە دەستی پێکرد).
سەرۆکی گۆڤاری تونوس (ریمۆند بورال)و (فیلیب بارنیی) بیرۆکەی کۆکردنەوەی دەستەیەك پزیشکی فریاکەوتنیان گەڵاڵەکردبوو، سەرەتا ناویان نابوو (فریاکەوتنی پزیشکی فەرەنسی)، بورال ئەو ڕۆژەی باش لەبیرە کە دیمانەی کۆشنێری کردبوو، ئەویش داواکاربووە بێتە ناو ڕێکخراوەکەیان، ئەو وتبووی من زووتر لە بیاڤراش کارم کردووە، دەتوانێت زۆر لە هاوڕێیەکانیشی بێنێتە ناو ڕیزی ڕێکخراوەکە. لە ڕۆژی ٢٢ی دیسمبەری

سالّی ١٩٧١ لە بارەگای گۆڤارە پزیشکییەکە دکتۆرە کارەکەرەکانی بیاڤرا لەگەڵ دەستەی گۆڤارەکە کۆبوونەوە، لەناو دانوستانی کۆبوونەوەکەدا ئامادەبووان لەناکاو بیرۆکەی ئەوەیان بۆ هاتبوو کەوا ناوی رێکخراوەکەیان شیاوو باش نییە، لەئەنجامدا بریاردرا ناوەکەی بکەنە پزیشکانی بێ سنوور، بریارەکەش وەك باسکراوە لەسەر پێشنیاری کۆشنێر نەبووە، بەڵکو فیلیپ بارنیی ناوەکەی هەڵبژاردووە، پاش ئەوەی چەند نامەی بۆ هەموولایەك رەوانەکردووە، ئەوەش راست نییە کەوا کۆشنێر بەڵگەنامەی رێکخراوی پزیشکانی بێ سنووری نووسیوەتەوە، بەڵکو ئەوەشیان لەلایەن بارونییەوە بووە، بۆیەش لەو بارەوە نووسیویەتی: (من بەیانەکەم نووسیوە، ماوەی نووسینەکەش تەنها دە دەقەی ویستووە، چونکە بنچینەو مەبەستەکانی دامەزراندنی رێکخراوەکەم زۆر لەبەرچاو بوو، دەمزانی ئامانجەکە چییە).

بەڵام کۆشنێر بە (ئان ڤالیری) وتووە کەوا دەستەی پزیشکەکان بەڵگەنامەی دامەزراندنەکەیان نووسیوە. لە رۆژی ٣ی ینایری سالّی ١٩٧٢دا بارینی بەڵگەنامەی بوونی رێکخراوی پزیشکانی بێ سنوور بلاودەکاتەوە، لە سەرەتای دەستبەکاربوونی رێکخراوەکە دوو نیگای کارکردن و بەرنامەرێژی لەلایەن دکتۆرەکانی بیاڤراو دەستەی گۆڤارەکەی تونوس هەبوون.

## جیاوازی لە بۆچوونەکاندا

دەستەی یەکەم لەگەڵ ئەوەدا بوون دەستەیەك لە پزیشکانی فریاکەوتن دوور لە رێورەسمی بیروکراتی یان بە پشتیوانیکردن رێکخراوێکی کارسازو دیار بۆ جێبەجێکردنی چەند کارێکی گچکە دامەزرێنن، بەڵام دەستەی دووەم لەگەڵ ئەوەدا بوون بەرنامەرێژییەکی دوور مەبەست و هەناسەدرێژ بۆ ئەو مەبەستە دامەزرێنن، کە لە لیژنەی دەولّی خاچی سووری بکات.

کۆشنێریش لەگەڵ ئەوەدا بوو تیمێکی تایبەت بۆ دەستەیەك پزیشك دامەزرێنن، کە بەلەز بگەنە شوێنەکان، کە رۆژنامەنووسانیش ناتوانن بگەنە ئەو شوێنانە؛ بە مەرجێك ئەندامانی دەستەکە جانتای فریاکەوتنیان لەشان بێت، هەر ئەو دەستەیە مەرجی ئەوەیان تێدا بێت هەموو گاڤێ ئامادەبن بگەرێنەوە پاریس بۆ گەیاندنی دیمەنەکان و شاهید حاڵیش بن لە رەوشی ناوچە گرداره سەختەکان، ئازایانەو ئازادانە هەموو راستییەکان ببێژن. لەگەڵ کارکردنی رێکخراوەکە چەندین بۆچوونی کارکردن و بەرنامەسازی گەڵاڵە دەبوو، لەوانە رەوتەکەی کۆشنێریش. لەناو کۆمەڵەی گشتی پێشووی پزیشکانی بێ سنوور لە رۆژی ٧ی مایوی ساڵی١٩٧٠دا کۆشنێر خۆی لەگەڵ دەستەیەکی ژمارە کەم دۆزیوەتەوە، ئەوانەش بۆیان نەدەکرا بۆچوونەکانیان بچەسپێنن، بۆیە ئەو دەست لەکار دەکێشێتەوەو لە مانگی ینایری ساڵی ١٩٨٠دا رێکخراوی پزیشکانی جیهان دادەمەزرێنێت، کە بەرنامەکەی لەسەر سێ تەوەر پێکهاتبوو، وەك (بگەنە ئەو شوێنانەی کەسی تر زووتر بۆی نەچووبن، ئامادەبن کاری خۆبەختکەرانە بکەن، بەلەزو بەزیندوویی دیمەنە بەژانەکان بگەێنە دەرەوەی مەرگەساتەکە).

## لەنێوان سربییەکان و هوتوکاندا

چۆن لەگەڵ هوتوکان لە رواندا مامەلەکرا، لەشەڕەکانی بەلقان بەهەمان شێوە مامەلەیان لەگەڵدا کرا، کۆشنێر لەو دوو حاڵەتەدا رۆڵی زۆری بینیبوو لە ریسواکردنی ئەو میللەتانەی کۆمەڵکوژییەکانیان ئەنجامدابوو، ئەوانی بە نازییش شوبهاندبوو. ئەو رۆڵەی لە یوگۆسلاڤیا بینیبووی بۆ دوارۆژ کاریگەری هەبوو لەسەر کاروانی سیاسی ئەودا. لە هەشت مانگەی حکومی (بیریگوفوی)یدا لە سەراییڤۆ، سەرۆك فرانسوا میتران زۆر لە رۆڵی کۆشنێر

ئەویّ رازی بوو، بۆیە متمانەی تەواو لەو بەدەست دەهێنێت، تا گەیشتە چەند پۆستی باڵاو بووتە دووەم وەزیری دەرەوە کە دەستی بگاتە هەموو دۆسێیەکان. کۆشنێر کە بووە کەسی بەنازی سەرۆك توانی فەرەنسا بەرەو دۆسێیەی سۆماڵیش ببات، ئەگەرچی وەزیری بەرگری ئەوددەمانەش (بییر جۆکس) بەو بڕیارە رازی نەبوو. ئەو توانیبووی ئیلتزامی فەرەنسا بە ئەفریقیاو کارنامەکانی بکاتە واقیع.

من لێرەوە لە ئەفریقیا دوور دەکەومەوەو بەرەو کارو چالاکییەکانی کۆشنێر دەچم بەرەو بەلقان. لەساڵی ١٩٨٨ سەرۆکی رێکخراوی پزیشکانی جیهان وەك رێزگرتن و ستایشکردن بە پۆستی سکرتێری دەوڵەت بۆ کاروباری مرۆیانە، ئەوەش خەڵاتی ئەوەبوو کەوا ئەو پێش هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی پشتیوانی ئاشکرای لەو کردبوو. کۆشنێر بۆ ئەوەی سەرنجی دائیرەی وەزارەتەکەی بۆ لای خۆی راکێشێت هەموو چالاکییەکان و کارەکانی بواری چالاکی مرۆیی خستبووە ژێر دەسەڵاتی خۆی، وەك ئەوەی خۆی سەرۆکی هەردوو رێکخراوی پزیشکانی بێ سنوورو پزیشکانی جیهان بێت.

## ئەو بە پاوانکردنی کارە مرۆییەکان تاوانبار کرابوو

لە یولیۆی ساڵی ١٩٩٠ سەرۆکی رێکخراوی پزیشکانی بێ سنوور (رۆنی برومان) کۆشنێری بەوە تاوانبارکردبوو کەوا ئەو کۆشش دەکات کۆنترۆڵی هەموو بەرنامە کارەکانی مرۆیی دەکات، بۆیەش بۆ کەناڵی پزیشکی تایبەت (کەناڵ سونتی) قسەی کردبوو، لەویّ پاش بۆمەلەرزە گەورەو کارەساتەکەی پاش رووداوەکە، سەبارەت بە گەشتەکەی ئەو بۆ وڵاتی ئێران وتبووی: (کە وەزیرێك لە شوێنی رووداوەکە دەبینین کە هاوشانی پیاوەکانی فریاکەوتنی فەرەنسی ئامادەیە، دەڵێن ئەوەیان تەواوو بەسە،

ئێمە سنوورەکانمان بەزانند، ئێمە کارنامەکەمان سەربەخۆیە؛ هەموو ئیلتیزامەکانمان دوورە لە سیاسەت، بۆیەش زۆر نامەعقولە کارەکانی ڕێکخراوەکەمان بکرێتە کارێك بە فەرمان و داوای حکومەت هەڵسوڕاوبێت. ئەوەیان مەعقولە نییە).

ئەو ڕەوشتو دەربڕینانە زۆر لە چالاکوانەکانمان لە بواری مرۆیی و فریاکەوتن نارەحەت دەکات، بەتایبەتی لە ڕۆژانی شەڕەکانی کەنداو، کە سکرتێری دەوڵەت پاش کۆتایی هاتنی مۆڵەتەکەی هێزەکانی هاوپەیمانان، ئەو لە وتارێکیدا کە لە ڕۆژنامەی لۆمۆند لە ڕۆژی ١٦ی ینایردا بڵاویکردیتەوە ئاماژەی بەو ڕامانەی خۆی دابوو. ئەو لە وتارەکەیدا تیشك دەخاتە سەر بوونی چوارچێوەیەکی نوێی سیاسەتی دەرەوەی فەرەنسی، کە لەسەردەمی (ڕۆڵان دۆما)دا واقیعی بوو. با لە بواری بیردۆزییدا بچینە ناو بواری پراکتیکدا، سکرتێری دەوڵەت لە سیاسەتی دەرەوە لە کوردستان پێوەری نوێی پەیرەو کردبوو. لەویّ لەژێر چەتری ڕێکخراوی فرنسا لیبریتی کە دانیال میتران سەرۆکایەتی دەکرد سیاسەتێکی نوێی دەرەوەی بەرجەستەکردبوو. کە لەسەر سنووری عێراق تورکیاو لە پرۆسەیەکی فەرەنسی ئەمریکییدا بەشداربوون، کە تێدا ئازووخەو خواردەمەنییان لە ئاسمانەوە بۆ پەنابەرو ئاوارەکانی سەرسنوورو ناو خاکی عێراق فڕی دەدایە خوارەوە. ئەو کارەش بە فڕۆکەی جۆری (ترانسال سی ١٦٠) دەکرا، کە باری ١١ تۆنیان هەڵدەگرت، خواردنەکەش بۆ ئەو ئوردوگایە بوو کە نزیکەی ٦٠ هەزار ئاوارەی لەناو تورکیا تێدابوو، هەروەها بۆ ٢٥٠ هەزاری کەسی تری ناو عێراقیش خواردەمەنیان فڕیّ دەدایە خوارەوە. ئەو چالاکییە مرۆیانەش لە بنکە سەربازییە ئەمریکییەکەی ئەنجرلیکی ناو تورکیاوە ئاسانکاری بۆ دەکرا. کە (گزافیی ئیمانویل) لە پاش کۆشنێر ئەو پۆستە وەردەگرێت، بە نارەحەتی باس لەو ڕەفتارانەی ئەو دەکات، کە ئەودەمانە ئەو سەرۆکی شەرەفی ڕێکخراوی پزیشکانی بیّ سنووربوو.

٤

# ئەگەر سیاسییەکان بلێن ئێمە بێجگە لە سیاسەت، ئیشی تریش دەکەین درۆ دەکەن!

ئیمانویلیی رامانی خۆی لە وتارێکی رۆژنامەی لۆمۆندی رۆژی ١٠ی مایۆی ساڵی ١٩٩١ چڕ دەکاتەوەو باس لە مەسەلەیەك دەکات کە ناوی نابوو (کۆتایی جیهان) بڵاودەکاتەوە، کە باس لەو حەشاماتە دەکات کە لە گوندی (کورکورکا) کۆدەبێتەوە، ئەو دیمەنە جەرگبڕە نیشانی ملیونەها بینەری جیهان درا، دیمەنەکانی گەورەیی کارەساتەکە لەگەڵ نمایشێکی یارییەکانی سێرك نیشاندەرا، ناوی (خنکانی میللەت)یان لێنابوو.

ئەو فیستیڤاڵە ریکلامێکی زۆری بۆ سازکرابوو، دیارە دیمەنەکانی کارەساتە گەواهی ئەوە بوون زۆر بایەخ بە مەسەلەکە بدرێت، بەڵام کۆنە برادەرەکەی برنار کۆشنێر، ئەو یەکە میدیایەی شوێنەکە، کە بە ئامادەبوونی هەموو دەزگاکانی راگەیاندنی جیهان، بۆ گەیاندنی هەواڵ و کارەساتی گەورەی رووداوەکەو کۆمەك دابەشکردنەکانی دەکرد، بەو جۆرە قسەی کردووە: (دەسەڵاتدارانی تورکیا زۆر بەخشندەبوون، ئەگەرچی رێگاکانی گەیشتن بە هەرێمەکە زۆر نالەبارو خراپ بوون، ئەوان توانیان سینییەکی چەماوەیی ئامادە بکەن کە لە ماوەی تەنها ٢٤ سەعاتدا شوێنەکەیان کردە مەڵبەندێکی میدیایی دەوڵی، کە بتوانن هەواڵ و وێنەکانی ئەو ٤٥٠٠ هاوڵاتییە بگاتە هەموو گۆشەیەکی جیهان، چ بە بەخشی تەلەڤزیۆنی راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ، یان بە تەلەفۆنەکان، بە فاکسەکان بە تیلیفاکسەکان هەموو کارکەربوون بۆ گەیاندنی کارەساتەکە بە هەموو گۆشەیەکی جیهان، وێنەکان جوان دەردەچوون، دەنگەکان باش بوون،

کارەکانی مکیاژو مۆنتاژ بە ئامێرەکانی سەر بە تۆڕی سی ئەن ئەن دەکرا، کە بەردەوام ئەوانیش راپۆرتەکانیان دەگەیاندە سالۆنەکانی نووسین و سازکردنی هەواڵەکان. ژوورنالیستان مەرگەسات و ژانەکانی ئاوارەیی کوردەکانیان لە کورکورکا دەگەیاند، لەودەمانە تۆڕەکانی ساتل شوێنەکەی بە شارستانیەت و جیهانی رووی بەرامبەریان دەگەیاند.

## کۆمەکە کوشتارەکە

ئەو دیمانەی لە تەلەڤزیۆنەکان نیشاندەدرا، هیمای هاوکاری و پشتیوانی بوون، کە لە ئوردوگاکان یان لەناو خیوەتەکان یان لەناو ئوتومبێلەکان و لۆرییەکان و لەناو رێگا تەنگەبەری هەورازەکانی شاخەکان گیرابوون، ئەو دیمەنانەبوون کۆمەڵگەی دەوڵیان هەژاندو کاروانی کۆمەکیان بۆ بەرێکردن، دەستی مرۆیانەیان بۆ درێژکردن. بۆ دابینکردنی سەلامەتی گەیاندنی پێویستییەکان فرۆکە جەنگییەکان ناوچەکەیان دەپاراست و بواریان ئاسان دەکرد فرۆکەکانی جۆری ئارکۆل زەخیرەو خواردەمەنییەکانیان بۆ فڕێ بدەنە خوارەوە.

زۆر لە کارتۆنەکانی خواردەمەنی کە قودییان تێدابوو بە چەتری پەڕەشووت بەسترابوون، هەندێ جاریش پەڕەشووتەکان لە ئاسمانا نەدەکرانەوەو هاتنە خوارەوەکە تێکدەچوو، هەندێ جار خواردەمەنییەکان دەکەوتە ناو سەربازە تورکەکان، یان ناو ئوردوگای خەڵکە هەڵاتووەکان، بۆیەش پیاوەکان و گەنجە هەرزەکارەکان پێشبڕکێیان دەکرد بۆ وەرگرتنی زۆرتر زەخیرەو خواردەمەنی ئامادە، هەندێ جاریش ئەو خواردنە دەکەوتنە ناوچە مینکراوە ترسناکەکانیش. کە ئازووخەکان لە ئاسمانەوە فڕێ دەدران، روویداوە کە بارەکە کەوتووتە سەر سەری خەڵکەکەو کەسانێکی بێ بەختی

بەرکەوتووەو کوشتوویەتی، ئەگەرچی دەکرا ئەو بارەو ئەو یارمەتیانە بە لۆری بگاتە شوێنەکان، چونکە پیاوانی میدیا بەئاسانی بەو ڕێگایانەوە دەگەیشتن، بەڵام بەردەوام لە فڕۆکەکانەوە فڕێ دەدرانە خوارەوە. ئیمانویلیی بەو شێوەیە باس لەو ڕۆژو لەو ساتانەی کردووەو وتوویەتی:

(کە خواردەکانمان لە ئاسمانەوە بۆ فڕێ دەدانە خوارەوە، بەوە ئالێین یارمەتی و کۆمەك، چونکە شێوەی فڕێدانەکە لەوە دەچوو ئەو خواردنە بۆ ئاژەڵان فڕێ دەدرێن. کە لە سەر دابەشکردنی خواردنەکان دەبووە شەڕو ناخۆشی، ناوم لەوە نەنا یارمەتی، کە لە کاتی دابەشکردنەکە دەکەوتنە گیانی یەکتری ئەوە یارمەتی و دەسگرتن نەبوو، پرۆسەی یارمەتی و فریاکەوتن گوتارێکی سۆزداری نییە، ئەوەیان پرۆسەیەکی براگماتی سنووورداری روون بوو.

تیمەکانی پزیشك و برینپێچەکان لەگەڵ بەرپرسەکانی تری ئەو پرۆسەیە، بە شان و بە دەستی خۆیان بیری توالێتیان بۆ خەڵکەکە هەڵدەکۆڵی، ئاسانکارییان بۆ هەڵگرتنی پاشماوەکانیان دەکرد، ئەوانیش خۆیان خاوەن پاشماوەکانیش هیچیان نەدەکرد، دیارە کەوا هیچ حکومەتیش ئەوەی پێ جێبەجێ نابێت ئەگەر لە نزیکەوە نەبێت، ئەگەر دەستی نەگەیشتە ناوچەکە، بۆیە هەندێ کەس لەگەڵ ئەوەن کە کارێکی هۆڤیانە لەگەڵ ئەو پرۆسانە بەکاربێت، دیارە ئەو کارانە بەبێ هێز ناکرێت، زووتریش ئەو کارانە بە مافی دەستێوەردانەوە کراوە، بەو جۆرەش پرۆسەکە کارەکانی بەڕێوە دەڕویشت.

❊❊❊❊

# سیاسەتمەدارەکان بێجگە لە سیاسەت هێچی تر ناکەن

ناکرێ گاڵتەمان بە وشەی مرۆڤایەتی بێت، ئەو کارە مرۆیانە بە سەربازەکان ناکرێت، ئەوان وەك سیاسەتمەدارەکان نین، سەرباز هەر ئەوەندە دەزانێت فەرمانەکان وەك خۆی جێبەجێ بکات، فەرمانەکان بە خۆشەویستی و ئازایانە رادەپەڕێنن، ئەوان کەسی گوێڕایەڵن، سیاسەتمدارەکان تەنها سیاسەت دەکەن، ئەگەر بڵێین ئێمە کاری تریشمان پێدەکرێت، ئەوانە درۆ دەکەن. رێکخراوە ناحکومییەکان و رێکخراوەکانی سەر بەنەتەوە یەکگرتووەکان دەتوانن بگەنە شوێنەکان و دەستیان دەڕوات، ئەوەشیان لەسەر فەرز دەکرێت، ناکرێ مرۆڤ خۆی لەسەر کەسانی تر فەرز بکات، نیشەکە بەندە بە شەرەفی مرۆڤ و رێزگرتن، ئەو مەرگەساتەش هەرگیز فیستیڤاڵ نەبوو، مەرگەسات بوو.

دوور لە هەڵوێستێکی ناشکرا، کە لە رۆژنامەی لۆمۆند پێش ١٧ ساڵ بڵاوکرایەوە، لە پێش پەردەکانی وەزارەتا، شەڕێکی دژوار لەنێوان کۆشنێرو نەیارەکانی لە کیدروسییی و وەزارەتی بەرگرییدا لەئارادابوو، لەودەمانە ئیمانویلیی بە دزی باسی گیان لەدەستدانی ئەو کەسانەی دەکرد کە لەئەنجامی کەوتنە خوارەوەی بارەکانی خواردەمەنی لە فڕۆکەکانەوە دەکرد، سەربازەکان و یاوەرەکانیان ئەوانەی لە بەرژەوەندی ئیستخباراتیدا کارکەرن بەروونی بۆچوونی خۆیا خستووتە روو، کەوا لەکاتی فڕێدانی بارەکان لەو فڕۆکەکانەوە دەیان هاوڵاتی بە بارەکان کوژراون. بەو بیانوویانەو بە وانەی ئیمانویلیی بانگهێشتی بۆ دەکردن، کارەکانی فریاکەوتن لە کوردستان راوەستاو کۆشنێریش لە وەسایەتی وەزارەتی ناوخۆدا دەگوازرێتەوە وەزارەتی دەرەوە. (ماری بییر سابیتل) لە رۆژنامەی لۆمۆندی رۆژی ٢٥ی مایۆی ساڵی ١٩٩١ نووسیبوی: (سکرتێری دەوڵەت کۆشنێر لەودەمانەی لە

وەسایەی وەزارەتی ناوخۆبوو، رای لەسەر چەندین هەڵوێستی فەرەنسا سەبارەت بە کێشە دەوڵییەکان باش نەبوو).
چەند هەفتەیەك بوو هاوپەیمانان هێزەکانیان بەناوی بەشداریکردن لە گەیاندنی کۆمەکی مرۆڤایەتی گەیشتبووە ناو کوردستان، قەدەر وایکرد گۆڕانکاری لەو وەزارەتە بکرێت کە ماوەیەك بە کۆشنێرەوە وەنووسابوو، کە ببووە (نەسپەکەی تەراودە)و بەردەوام سیاسەتی دەرەوەی فەرەنسی ئیعتمادی پێکردبوو. ئەوەی شایانی باسە کۆشنێر لەودەمانەی لە عێراق ئیلتزامی هەبوو، لە کۆمەکی قوربانییەکانی سەدام حوسێندا دەستبژێری دەکرد، لەودەمانەدا ئەو تەنها لایەنگیری کوردەکانی کردووە، یەك وشەی لە بەرژەوەندی قوربانییە شیعەکان نەکردووە، ئەگەرچی ئەوانیش بە هەزارەها کەس بوونە قوربانی رووداوەکەو زۆرداری رژێمەکە.

* * * *

## بەرنامەیەکی تر لە کۆنە یۆگۆسلاڤیادا

مارشال تیتۆ لە رۆژی ٤ی مایۆی ساڵی ١٩٨٠ و پاش مانەوەی ٣٥ ساڵ لەسەر فەرمانڕەوایی فیدراڵی یۆگۆسلاڤیا کۆچی دوایی دەکات، ئەویش لە شەڕەکانی دووەمی جیهانیشدا رۆڵی تێدا گێڕابوو. پاش مردنی ئەو کۆمارەکانی ئیشتراکی یۆگۆسلاڤیاو بەتایبەتی سربییەکان گردببوونەوە، کەپاشان لە سەرکردایەتی (سلوبودان میلوزوفیتش) لە مایۆی ساڵی ١٩٨٩ تا ئوکتۆبەری ساڵی ٢٠٠٠دا مایەوە.
پێشەوای ئیشتیمانی سربییەکان (میلان بابیك) نەوتی بە ناگرەکە داکردو کە لە رۆژی ٢٨ی فبرایردا سەربەخۆیی سربی کرایینای راگەیاندو کە سنووری کۆمارەکەشی دەگەیشتە کرواتیا، پاش ئەو بەیانەو لە بەهاری ئەو

ساڵەدا شەڕو ناکۆکییەکان گەرم دەبێت، لەئەنجامدا هەردوو وڵاتی سلۆڤیناو کرواتیا سەربەخۆیی خۆیان راگەیاندو لە فیدراڵییەتی یۆگۆسلاڤیادا جیادەبنەوە، پاش ئەوەی بەپێی دەستوورەکەیان ریفراندۆمیان لە رۆژی ٢٥ی یونیۆی ساڵی ١٩٩١ سازکردبوو، زوو وڵاتەکانی ئەڵمانیاو نەمساو فاتیکان ئیعترافیان پێدەکەن، پاشانیش وڵایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش ئیعتراف بە دەوڵەتی کرواتیای نوێ دەکات. پاش ٢٤ سەعات لە راگەیاندنی سەربەخۆییەکەی سلۆڤیناو کرواتیا سوپای فیدراڵ کە لە هاوڵاتیانی سرب و مونتی نیگرۆ پێکهاتبوو کۆششیان کرد بەهێزو بە سوپاکەیان چوارچیوەی فیدراڵییەکە راگرن، کە تێدا شەڕی خوێناوی لەنێوان هێزە میللییەکانی سەربەخۆیی و هێزەکانی فیدراڵی روویدا. یەکێتی ئەورووپی لە رۆژی ٢٧ی ئۆگستی ساڵی ١٩٩١ لیژنەیەکی پێداچوونەوەو چارەسەرکردنی بە سەرۆکایەتی (روبیر بادانتر) پێکدەهێنێت، پاش دەراسەتی دۆسێیەکە بە قووڵی لیژنەکە دەگاتە ئەو راستییەی کەوا فیدراڵییەکەی یۆگۆسلاڤیا بەرەو هەڵوەشاندنەوە دەچێت، بۆیە وا باشە ئیعتراف بەو دوو وڵاتە جیابووەکە بکەین. لەو روانگەوەو لەبەر رۆشنایی راپۆرتی لیژنەکە یەکێتی ئەورووپی دان بە شەرعیەتی ئەو دوو وڵاتە نوێیە دەنێت، ئەوە شەهادەش وەفاتنامەی فیدراڵی یۆگۆسلاڤیای دەگەیاند.

## گەمارۆی سەراییڤۆ

لەودەمانەدا سربییەکانی کۆمارەکانی فیدراڵ بە سەرۆکایەتی کەسایەتی نیشتیمانپەروەرەکەیان (رودوڤان کارازدیتش) کۆدەبنەوەو چوارچیوەیەك بۆ خۆیان سازدەکەن، بۆیەش سەرۆکی کرواتی (فرانگو توجمان) داوا دەکات هەموولایەك بەرەو سوپاسازکردن بێنە مەیدان و بەرووی پرۆژە مەزنەکەی سربییەکان بوەستن، کە سربییەکان بەناشکرا بانگهێشتیان بۆی دەکرد.

لە رۆژی ۲۹ی فبرایری ساڵی ۱۹۹۲ نۆرەی بۆسنەو هزرەگۆڤیینا هات داوای سەربەخۆیی بکەن، ڕێژەی ٦٣٪ هاوڵاتییەکانی بۆسنی پشتیوانییان لە سەرکردەکانیان بۆ ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی وڵاتەکەیان لە یۆگۆسلاڤیای فیدراڵ ڕاگەیاند، کە ٤٣٪ لەو هاوڵاتیانە موسلمان بوون، کرواتەکانیش ڕێژەی ۱۷٪ یان پێکدەهێنا، بەڵام سەربییەکانی ئەو وڵاتە دەنگیان دژ بە سەربەخۆییەکە دابوو. کۆمەڵگەی دەوڵی زوو دانیان بە سەربەخۆیی ئەو وڵاتە نابوو، بەوەش هەر سێ وڵاتە نوێیەکە بوونە ئەندام لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان.

بۆسنەو هزرەگۆڤییناش وەك هەردوو وڵاتەکەی پێشووتر کرواتیاو سلۆڤێنیا کە سەربەخۆییان ڕاگەیاندبوو، دووچاری هێرشی زۆر بەبەرنامە بوونەوە، سوپای سربیی فیدراڵ بەتوندی شەڕی کردن، لە رۆژی ٥ی ئەپریلی ۱۹۹۲دا بۆسنەکان سەرایێڤۆیان گەمارۆدابوو، هێرش و گەمارۆییەکە تا رۆژی ۲۹ی فبرایری ساڵی ۱۹۹٦ی خایاند، بەوەش ئەو گەمارۆیە دەکرێ بە درێژترین گەمارۆی نوێ لە مێژووی هاوچەرخدا ئەژمار بکرێت.

لشبۆنە لە رۆژانی ۲٦و ۲۷ی یولیۆی ساڵی ۱۹۹۲ کۆنفراسی لوتکەیی وڵاتانی یەکێتی ئەورووپی لێدەگیرا، کە تایبەت بوو بە ئەجندەکانی واژۆی ڕێکەوتنامەی ماستریخت، لەو کۆبوونەوەیەدا پشتیوانیشیان لە بایەخی زۆری دوارۆژی یەکێتی ئەورووپی کردەوە. لەو کۆنفراسە هەردوو سەرۆکی فەرەنسی فرانسوا میتران و ڕاوێژکاری ئەڵمانی هیلمۆت کۆل بەیانییەکەی رۆژی ۲۷ی فبرایریان لەسەر یەك خوانی نانخواردن کۆیان دەکاتەوە، بەیەکەوە باس لە ڕەوشی ناڵەبارو شەڕو گەمارۆییەکەی سەرایێڤۆیان کردبوو. هەر لەو شەوەدا وەزیرانی دەرەوەی وڵاتانی یەکێتی ئەورووپی کۆدەبنەوە، لەوێ بڕیارێك وەردەگرن بۆ گەیاندنی کۆمەك و خزمەتە مرۆییەکان، بەڵام بە پشتیوانی سەربازی.

# تووڕەبوونی کۆشنێر

کۆشنێر لە پاریسەوە بانگ دەکرێت، هەر لە هوتێلەوە تووڕەیی دەردەبڕیت و ناڕەزایی پێوەدیارە، تازە ئەو هەواڵەی بیستبوو کەوا بە پشتیوانی وەفدە ئەوروپییەکە بەرەو سەراییڤۆ ڕێ بکات، ئەو وتبووی من بەرەو سەراییڤۆ نافڕم، قسەیەکیش هەبوو گوایە چالاکییەکە بەسەرۆکایەتی (ڕۆلّان دوما)یە. کۆشنێر تازە پۆستی وەزارەتی تەندروستی و کاروباری مرۆیی وەرگرتبوو، ئەو مەبەستی بوو بە هەر نرخێك بێت ئەو ببێتە سەرۆکی کارەکە، ئەو زووتر زۆری قسە لەگەڵ سەرۆکی فەرەنسی کردبوو ئەوان کارێك لە بۆسنە بکەن. فرانسوا میتران کە بڕیاردەدات سەفەری بۆسنە بکات کۆشنێر لەگەڵ خۆیدا دەبات، چونکە ئەو زۆری خۆشدەویست و زۆریش گوێ لە قسەکانی رادەگرت.

ئەگەر کێسی بۆسنە بەلاوە بنێن، ئەوا میتران هەستی کردبوو کۆشنێر پیاوێکی سیاسی زۆر ناودارەو هەموولایەك خۆشیاندەوێت، لە راپرسییەکانیشدا دەنگی زۆری وەرگرتووە، ئەو دەیزانی دەکرێ ئەو پیاوە وەك ئاڵەتێك لەکاتی پێویست بەکاربهێنێت، چونکە ئەودەمانە ئەو تەندروستی باش نەبوو و لەلایەن (کلارسفیلد)و هاوڕێیەکانی هێرشی کرابوو سەر، هەروەها قازی (جۆن بییر)یش هێرشی کردبوو سەر.

****

# میتران و کۆشنێر بەرەو سەرایێڤۆ

میتران و کۆشنێرو دوو ژوورنالیست ئەوانیش (فیرونیك دیکودو) لە ئاژانسی هەواڵەکانی فەرەنسی و (کلۆد ئازولای) لە باری ماتشەوە بەرەو ناوچەکە دەفڕن. سەرۆك لەگەڵ وەزیرەکەی لە سلیبت لەگەڵ وەزیری دەرەوەی کرواتیاو سەفیری فەرەنسا کە لە زغربەوە گەیشتبوو دەمینێنەوە. لەو سەردانەدا سەرۆکی فەرەنسی میتران، وتبووی سەفەرەکەمان تەنها بۆ یارمەتی مرۆییەو بەس، ئەو هەواڵەش لە سەرایێڤۆ زۆر بەخۆشحاڵییەوە پێشوازی لێکرابوو. لەوێ کۆشنێر لە ڕۆژی ٢٨ی یونیۆو بە گەیشتنی بە ڕۆژنامەکانی ڕاگەیاندبوو: (مەسەلەکە تەواو بوو، فڕۆکەخانەکە دووبارە سەرلەنوێ کرایەوە).

کارو بەرنامەی سەرۆکی فەرەنسی و وەفدە یاوەرەکەی شەش سەعاتی خایاندبوو، لەوێ سەردانی پیاوە کلّاو شینەکانی هێزەکانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکانی کردبوو، ئەوانەی بەرپرسبوون لە پاراستنی گەیاندنی کۆمەکە مرۆییەکان، هەروەها سەردانی نەخۆشخانەکانی کردبوو، کە زۆر لە ڕۆژنامەکان لەسەریان نووسیبوو کەوا کەماسییان زۆرەو هەموو شتێکیان پێویستە، بەڵام پاشان بۆیان ڕوون دەبێتەوە کەوا زانیارییەکان هەڵەبوون، چونکە دەرکەوت کەوا نەخۆشخانەکان سێ مانگ پاش سەردانەکەی میتران ئینجا کەماسی تێدەکەوێت و داوای زۆر کەلوپەلی پێویست دەکەن.

میتران لە کۆشکی کۆماری نانی نیوەڕۆ دەخوات، کە سێ گوللە تۆپیشی لەنزیکەوە دەکەوێتە خوارەوە. سەرۆك عەزەت بیگوفیتش پێش ئەوەی بە ڕۆژنامەکان ڕابگەیێنێت، لەوێ بە سەرۆکی فەرەنسی وتبوو، کەوا لە بۆسنە چەندین ئۆردگای قڕکردنی نەژادی بوونی هەیە. دیارە کەوا سەرۆك میتران حەزی لە کردەوەی ڕەمزی دەکرد، بۆیە گوڵێك لەپێش نانەواخانەیەك

دادەنێت کە تازە گوللە تۆپێك خاپووری کردبوو. کە تێدا دەیان کەسی کوشتبوو، لەوێیەوە دەچێتە ئەو مەڵبەندەی پرێس کۆنفراسەکەی تێدا سازدەکرا، کە لەپێش ڕۆژنامەنووسەکاندا دەبێژێت:

(با ببینن و ببیستن و هەستبکەن و گوێبگرن).

هەر لەو کۆنفراسەدا میتران وتبووی:

(تێوەگلاندنی ئەو ناوچەیەی کە شەڕی تێدایە بە شەڕێکی تری نوێ کێشەکە چارەسەر ناکات).

لەسەر ئەو هەڵوێستەش (ڕۆنی برومان)یش وتبووی:

(میتران وەك سەرۆکی کۆماری فەرەنسی لە فڕۆکەخانەی سەرایێڤۆ نیشتووە، بەڵام وەك سەرۆکی ڕێکخراوی خاچی سووری دەوڵی گەڕاوەتەوە).

سەردانەکە بەوە کۆتایی هاتبوو، کەوا هێزەکانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکانی راسپاردووە فڕۆکەخانەی سەرایێڤۆ بپارێزن، بواریش سازدەکات پردێکی خێرخوازی مرۆییش بۆ گەیاندنی یارمەتی و کۆمەکی خواردەمەنی دروست بکرێت. ئەو پردەش دەبێتە پردی گەیاندنی یارمەتییە مرۆییەکانی نێوان سەرایێڤۆو جیهانی دەرەوە، تا ئەو ڕۆژەی پردەکە لە ٢٩ی فبرایری ساڵی ١٩٩٦ دەگیرێت.

## سوودەکانی گەشتەکەی سەرایێڤۆ

سەردانەکەی میتران بۆ سەرایێڤۆ سوودی ڕاستەوخۆی زۆری هەبوو، بەوەش پێگەکەی زۆر بەهێزدەبێت. کە فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانەی پاریس دەنیشێت، سەرۆك هەریەك لە (بییر جۆکس)و (ڕۆلان دۆما) دەبینێت، بۆیەش تووڕە دەبێت و دەڵێت: (تۆ پاڵەوانەکەی نیمڕۆیت، بۆیە ترستت نەبێت، بەپێچەوانە لەو ڕۆژەوە تۆ زۆر بەهێزتر بوویت).

بەو قسەیە کۆشنێر هەست بەسەرفرازی دەکات، بۆیە وتبووی:
(لە کۆتایی کاری مرۆیی حەقی ئەوەی پێدرا لەگەڵ سیاسەتدا ناوی بهێندرێت).

لەو رۆژەوە ئەو ناوی دەکەوێتە ناو بازنەی نزیکی سەرۆك فرانسوا میتران. کە فەرەنسییەکان لە مانگی سپتەمبەرو لە رۆژنامەکاندا هەواڵی ئەوەیان خوێندەوە کەوا سەرۆك رازیبووە کۆشنێرو (کریستین ئوکرانت)ی هاوسەری ماوەی پشوودانەکەیان لە بال ئیبل ئون مار بەسەربەرن.

رۆژنامەی نیویۆرك نیوزدای کە رۆژنامەیەکی ئاساییە لە رۆژی ۲ی ئۆگستی ساڵی ۱۹۹۲ وتارێکی (روی غاتمان) بەناوی (ئوردوگای مردن) بڵاودەکاتەوە، تێیدا باس لە گرتووخانەی سربییەکان دەکات، لەوانە گرتووخانەی (ئومارسکا)، ئەو زاراوەی (تێپەستان)ی بۆ بەکارهێناوە، دانیش بەوەدا دەنێت کەوا ئەو سەردانی ئەو گرتووخانەیەی نەکردووە، بەڵام لە دوو سەرچاوە زانیارییەکانی بەدەست کەوتووە، یەکەمیان _ کە زۆر لەو دڵنیا نییە _ کە تایبەتە بەو شاهیدییەی لەو شوێنەوە دراوە ئەویش کەسێکەو سەربەرشتی کردووەو ناوی (ئالیغا لۆجینوڤیك)بوو، ئەو وتبووی ۳۵۰۰ کەس لە بارکۆ لە ماوەی نێوان مانگی مایۆ تا یونیۆ کوژراون. کەسی دووەم کە سەرچاوەی هەواڵەکەیە ناوی (میهۆ) بوو، ئەو بە وردەکارییەوە باس لە کۆشتنکارییەکانی گرتووخانەی ئومارسکا دەکات.

ئەو وتارە لەلایەن چەندین رۆژنامەو دەزگاکانی تری میدیای ئەمریکییەوە دووبارە بڵاودەبێتەوە، ئەوەش نووسەرانی کتێبەکەی (کێشەکانی کارکردنی برنار کۆشنێر لە یۆگۆسلاڤیادا)، (میشال فلوکت)و (براتراند کۆك) لە کتێبەکەیاندا ئاماژەیان پێداوە.

ئەگەر گرتووخانەکە لەلایەن سربییەکان بووبێت، یان لەلایەن کراوتییەکان و یان موسلمانە بۆسنییەکانەوە بێت، ئوردوگاکەو شێوەکانی کۆمەڵکوژییەکان نەگەیشتووتە دڕندەیی ئوردوگاکانی مردنی سەردەمی نازییەکان لە رۆژانی شەڕی دووەمی جیهانیدا.

٥

# کۆشنێر لە رۆژنامەنووسێك تووڕەدەبێت، ژنەکەشی لە سەرکار دەریدەکات.

کـە میـدیای جیهـانی نـاوی (ئوردوگـای مـردن)و (گرتووخانـە)یـان بڵاوکردەوە، دووبارە باس لـە قڕکـردن و جینوسـاید کرایـەوەو ئـەو پرۆسـەیە بـەبیر خەڵکەکـە هاتـەوە، بـەڵام جیاوازییەکـەی ئـەو جـارە لـە وڵـاتی یۆگۆسلاڤیای پێشوو بوو. ئەو بابەتەش بووە بەرنامەو کارنامەی کۆشنێر کە کاری لەسەر بکات، وەك چۆن پیاوێکی کارامەو بەتاقەتە بەو جۆرەش لەگەڵ هاوڕێیەکانی کـە دەسـتەیەك لـە کەسـانی روونـاکبیربوون، لەوانـە (باسـکال بروکنار)و (ئالان فینکیلکرۆن)و (ئەندری گوکسمان)و هەروەها (برنار هنـری لیڤی) کەوتە مەیدانەکەو بەیەکـەوە کۆشـشیان کـرد، ئـەو پێـشهاتەی لـەو ناوچەیە لەئارادایە شەرمەزار بکەن، هەر یەکێك لەوانە لە پێگەی خۆیـەوەو بەگوێرەی تواناکانیانەوە ناڕەزاییان دەردەبڕی.

سربییەکان ئوردوگای ئومارسکایان بەرووی تەلەڤزیۆنی بریتانی کردووە، ئـەوەش بـۆ پەرچـدانەوەی ئـەو هەڵمەتـەبوو کـە کۆشـنێر دژی سـربییەکان رابەرایـەتی دەکـرد، دەسـەڵاتدارانی سـرب لـە بـەلگرادەوە چـاودێری کـاری سربییەکانی بۆسنەیان دەکرد، کۆششیان دەکرد بەرای گشتی رابگەیێنن کەوا گیراوەکانی ئەو ئوردوگایە قوربـانی کۆمەڵکوژییـەکان نـین، بـە دڕەنـدەییش رەفتاریـان لەگەڵـدا نـەکراوە، ئوردوگاکـەی ئومارسـکاش نەبوویتـە هـەردوو ئوردگای (بیرکینو)و (ئوشڤیتز)ی نازییـەکان. بـەڵام لەهـەمان شـەودا وێنـەو دیمەنی تری پێچەوانەی ئەو قسانە بڵابوونەوە، کە تێدا چەند پیـاوێکی لـەڕو لاوازییان لە پشت تێڵبەندەکانەوە دەرهێنابوو، ئەوەش کاردانەوەیەکی توندی بەرووی بەلگراد کردەوە، ئەوەش بۆچوونی بینەرانی بـەردو ئاراسـتەیەکی تـر

بردو لە خۆرئاوا مەسەلەکە بەرەو ئاراستەیەکی تر دەڕۆیشت. لە شەوی ١١_١٢ی ئۆگستی ئەنجومەنی ئاسایش هەردوو بڕیاری ژمارە ٧٧٠و ٧٧١ی دەردەکات، کە تێدا مەرجی چوونە ناوەوەی لیژنەی خاچی سووری دەوڵی و هەموو ڕێکخراوە مرۆییەکان دەدات بۆ ناو ئۆردوگاکەو گیراوەکان ناونووس و تۆمار بکرێن، کە ژمارەیان شەش ئۆردوگای کرواتی و دووی سربیی و یەکێکیانیش بۆسنی بوو.

لەودەمانەدا کۆشنێر لەگەڵ (بونوا گیسمبرگ) لە باری ماتش و (ئیزابیل نایلس) لە لۆژونال دو دیمانش و (دیدیی فرانسوا) لە لیبراسۆن و (ناهیدا ناکاد) لە تی ڤی ١ بەرەو بۆسنە دەفڕن، بەڵام پێش ئەوەی بگەنە بۆسنە بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆییدا (شارل لامونییر)ی کارمەندی دەسەڵاتدار لە نەتەوە یەکگرتووەکان ببات فڕۆکەکە لە ژەنێف دەنیشێتەوە. بۆ بەیانی کۆشنێر لەگەڵ دەسەڵاتدارە سربییەکان ئۆردوگای ئومارسکا بەسەردەکاتەوە، بەڵام پێش ئەوەی ئەو بگاتە ئۆردوگاکە، گیراوەکانیان دووردەخەنەوەو زیندانەکە تەنها ژمارەیەکی کەمی تێدا دەمینێتەوە. پاش ئەو شوێنە کۆشنێر دەگاتە گرتووخانەی مانجاکا، لەوێ هەستدەکرا هەندێ دیاردەی ڕاستی هەیە، دیاربوو ژمارەی گیراوەکان لە قەبەو ڕووبەری گرتووخانەکە تەسکتربوو، ژمارەکە زۆربوون. پێش ئەوەی کۆشنێر بگەڕێتەوە دەچێتە ترنوبولی، لەوێش هەست بە هیچ ناکات شیاوی باس بێت، کە دەچێتە ئۆردوگای بۆسنیاو لە گرتووخانەیەکی سەربازی تریش تێدابوو، لەوێ هیچ نابینێت. کۆشنێر پاش هەفتەیەك چیرۆکەکەی لە باری ماتش دەنووسێت، لەوێدا نووسیبوی من ئەو ئۆردوگاو گرتووخانانەم لە دوا ساتەکانی سەفەرەکەم هەڵبژاردبوو.

❊❊❊❊

# پیاوە گێلەکەی دەسەڵاتدارانی بەلگراد

کۆشنێر لەو سەفەرەی کە ٤٨ سەعاتی خایاندبوو، وەك خۆی وتبووی من شوێنەکانم خێراو لە دوا ساتەکاندا هەڵبژاردووە واتە من لەناکاو چوومەتە شوێنەکان. پێش ئەویش چەندین رۆژنامەنووس سەردانیان کردبوو، بەڵام گرتووخانەکانی تر بەرووی دەزگاکانی راگەیاندن داخرابوون، کەسیش سەردانی نەکردبوون. وەزیرەکەو تیمە یاوەرەکەی بۆ ناوچەکە وشەی شەڕو خراپەکاری یەك ماناو ناوی هەبوو، ئەویش (سرب)بوو، لەودەمانەدا هەڵوێستی گەیاندنی مرۆیی و شەڕی خێر بەرووی شەڕ دەست پێدەکات، ئەوانە دەتوانن لە دیدی رای گشتییدا بەناوی ئەخلاقی سیاسی و بەرگری لە مافەکانی مرۆڤ پێگەیەك بنیات بنێن. کۆشنێر خۆی لە شوێنی (بییر هارمیت) دانابوو کەوا ئەو بە ناوی کەسە بەوەفاکان داوایکردبوو بەرەو خاکە پیرۆزەکەو لەپێناوی یەکەم شەڕی خاچپەرستەکان و بۆ ویستی خودا بەڕێ بکەون.

بەپێی وتارێکی رۆژنامەی نیویۆرك تایمز دەزگای ئیستخباراتی ئەمریکی کۆششی زیاد دەکات بۆ سەرگرتنی کارو بەرنامەکەی ئەوان و پشتیوانیان لێ دەکات، بەڵام ئەو لەو سەفەرەییدا هیچ بەڵگەیەکیان لەسەر کۆمەڵکوژییەکەی گیراوە کرواتییەکان و موسڵمانەکان لە ئوردوگاکانی سربییەکان دەست ناکەوێت.

* * * *

# هەڵمەتێکی ڕاگەیاندن

ڕێکخراوی پزیشکانی جیهان بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەشیان لەسەر کۆمەڵکوژییەکە لەدەستدا بێت سربییەکانیان بەو کارە دڕندەییە تاوانبارکردو هەڵمەتێکی گەورەیان لە مانگی ینایرو فبرایری ساڵی ١٩٩٣ بەرپاکردبوو، لەودەمانەش ئەنجومەنی ئاسایش و کۆمەڵگەی دەوڵی و هێزەکانی نێونەتەوەیی کۆشسیان بوو شەڕەکە ڕاگرن، بەڵام هیچ بەرهەمی نەبوو.

خەرجی و پارەی هەڵمەتی ڕاگەیاندنەکە لە ماوەی چەند هەفتەیەك لە تەلەڤزێونەکانی فەرەنسی بە دوو ملیۆن دۆلار مەزندە دەکرا، مەبەستی سەرەکی هەڵمەتەکەش ئەوەبوو سربییەکان و کارە دڕندەییەکانیان بۆ ڕای گشتی بە نازییەکان بشوبهێنن.

ڕۆژنامەی لۆمانیتی شوعییەکان لە ڕۆژی ٦ی ینایری ساڵی ١٩٩٣ وتارێك لەسەر ڕێکخراوەکەی کۆشنێر بڵاودەکاتەوەو دەنووسێت:

(ڕێکخراوی پزیشکانی بێ سنوور ڕۆڵێکی زۆر ترسناك دەگێڕن، ئەو ڕێکخراوە کە لە ڕێکخراوی پزیشکانی بێ سنوور جیابوویتەوە، کۆشنێری وەزیر بەئاشکرا کۆمەکیان دەکات، ئەو وەزیرە سەرچاوەی سەرەکی پارمەتیەکانی ئەو ڕێکخراوەیە، مەبەستی سەرەکییان ئەوەیە لەسەر ئاستی مرۆیی بچنە ناو کێشەکە).

ڕێکخراوەکە لەسەر بنەمای هەڵەی چەند سەرچاوەیەکی چەواشەدا هەڵمەتەکەی دەست پێکردبوو، پاش چەند ساڵێك کۆشنێر لە کتێبەکەی بەناوی (شەڕکەرانی ئاشتی) ئەو چەواشەو ساختەکان ئاشکرا دەکات.

کۆشنێر لەگەڵ سەفیری ئەمریکی (ڕتشارد هۆلبرۆك)و سەرۆکی بۆسنیی پێشوو (عەزەت بیگوفیتش) سەردانی نەخۆشخانەی سەرایێڤۆ دەکات لەوێ پیاوەکە دەمرێت و سەعاتەکە سەعاتی ڕاستگۆیی بوو.

ئەو لە بیگوفیتش دەپرسێت:

_ تۆ سەردانەکەی سەرۆك میترانت لەبیرە...؟

ئەو لە وەڵامدا دەبێژێت:

_ بەڵێ، تا ئێستاش ئەو سەردانەم لەبیرە.

کە بەیەکەوەبوون باسی بوونی ئوردوگای قڕکردنی لە بۆسنە بۆ کردبوو، ئەوەشی بە رۆژنامەنووسان راگەیاندبوو.

_ دەزانی قسەکانی تۆ شەپۆلێك نارەزایی و نیگەرانی لە جیهان خولقاندبوو.

_ فرانسوا منی رەوانەی ئومارسکا کردبوو، دەرگای گرتووخانەکانمان کردەوە، شوێنەکان جەرگبڕو ترسناك بوون، بەڵام مەسەلەکە نەگەیشتبووە رادەی قڕکردن، ئەوە دەزانی..؟

_ بەڵێ. عەزەت بیگوفیتش دان بەوەدا دەنێت، من وامزانی لێداوانەکانم هێرشەکە گەرمتردەکات، من کاردانەوەی فەرەنسییەکان و ئەوانی تریشم بینی... من لەوەدا هەڵەبووم.

_ بەڵێ، من کۆششم کرد بەڵام بۆچوونەکانم هەڵەبوون، ئوردوگاکانی قڕکردن بوونیان نەبوو، بەڵام شوێنەکان ترسناك بوون.

ئەو پیاوەی جاران بە فرانس دکتۆر دەناسرا، لە بەلقانیش بە بیانووی کاری مرۆیی هەمان بۆچوونی دەستێوەردانی بیافرای دەبینی، ئەوەش دەرچوونێکی لەناکاوبوو کە بینیمان هاوسەنگی گشتی لەنێوان هەڵسوکەوتەکانی کۆشنێر لە بەلقان و هەڵوێستی ئەمریکییەکان هەبوو لە تەقاندنەوەی فیدراڵیەتی یۆگۆسلاڤیا، بۆ پشتیوانی لە وڵاتە نوێیەکانی بەلقان بۆ دژایەتیکردنی مۆسکۆ، بەوەش بەرژەوەندییە نابووریی و ستراتیژییەکانیان بەهۆی پەیمانی ئەتلەسی بەدەست دەهێنێت.؟!

****

## کیسە برنجەکان و شۆڕشەکەی کۆشنێر

ئیریك ئامبتاز لە لۆکانار ئونشینییدا لە رۆژی ٩ی دیسەمبەری ساڵی ١٩٩٢ نووسیبووی: (ئای کە دیمەنەکە نازداربوو، وێنەی برنارو فەردە برنجی جۆری ئەنکل بانزەکە، ئەو کەوتبووە ناو تۆزو غوباری لۆرییەکان).

لەو رۆژانە وەزیری دەرەوەکەمان ئەو رۆژانەی لەبیرماوە لە ناو شەرەکاندا فەردە برنجی لەسەرشاندا بوو، چاوێکی لەسەر کامیراو چاوێکی لەسەر قەدەری خۆی بوو. وەزیری دەرەوەی فەرەنسی لە دیمانەیەکی تەلەڤزیۆنی فرانس ٢٤داو لەپێش رۆژنامەنووس (پولیس غوسی)و لە بەرنامەی تۆك شو پاریسداو لە رۆژی ٢٨ی یولیۆی ٢٠٠٨ گۆبەندێکی ناوەتەوە. دەپرسین بۆ...؟ بۆچی کۆشنێر ئەو هەرایەی دروستکردبوو...؟ کۆشنێر بەو وێنانەی کە بە وێنەی ناشیرین ناوی بردن، وێنەکان پورتیریێت بوون کە پێش دیمانەکەی لەگەڵ رۆژنامەنووسەکە دەرچووبوون. بڕوا بکەن پاش چوار مانگ لەو دیمانەیە چ روویدا. پاش چوار مانگ رۆژنامەنووس پولیس غوسی ناچارکرا کەناڵی فرانس ٢٤ بەجێبهێڵێت، کە هاوسەرەکەی کۆشنێر لە کەرتی راگەیاندنی بینراوو بیستراو بەرپرسایەتی دەکات.

## پشتیوانییە ئەمریکییەکە

کۆشنێر لە مقادیشۆ ببووە کەسێکی نێودەولی، بەپێی ئامارەیەکی رۆژنامەی تایم ئەو یەکێکە لەو ٦٠ پاڵەوانەی ساڵانی دوایی لە جیهاندا. وەك چۆن کارکردنەکەی ئەو لە بیافرا چەندین دەرس و نهێنی تێدابوو، لە سۆماڵیش لە ساڵی ١٩٩٣ سوودی زۆری بینیبوو، نەك لەبەرئەوەی سەربازانی ئەمریکی بۆیان نەکرا کێشەو گرفتەکان چارەسەر بکەن، ئەوەش

بووە تەگەرێك كە نەتوانن یارمەتییە مرۆییەكان بگاتە سۆماڵ، بەڵام چالاكییەكە زۆر بە گەورەیی شكستی هێنابوو. پاش كوژرانی ١٨ سەربازی ئەمریكی لە شەقامەكانی مقادیشو خۆرئاواییەكان وڵاتەكەیان لەناو زەلكاوی خوێن جێهێشتبوو. لەوەدەمانە كۆشنێر سەرقاڵی كارو بەرنامەكانی خۆی بوو لە ناوچەكانی بەلقان و قۆچی ئەفریقی و ناوچەی دەریاچە گەورەكان، ئەو دوو شوێنەش ئەمریكییەكان بایەخی زۆریان پێدابوو، هەمووش لەژێر چەتری بەرگری لە بنچینە پیرۆزەكان و رێزگرتنی مافەكانی مرۆڤ و كۆمەكە مرۆییەكاندا بوو.

وڵایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە دە ساڵەی دوایی سەدەی رابردوو بایەخی زۆریان بە سەركردە گەنجەكانی ئەفریقیاییەكان دەدا، بۆیەش پشتیوانی لە سەركردەی ئۆغندی (یوری موسیفینی) دەكرد، رۆڵی بینیبوو لە دانانی (بۆل كاگام) بە سەرۆكی رواندا و دانانی (ئیسیاس ئەفیوركی) بە سەرۆكی ئەریتریاو (میلیس زیناوی) بە سەرۆكی ئەسیوبیاو (لۆران دیزیری كابیلا) بە سەرۆكی كۆماری كۆنگۆی دیموكراسی. لەلایەكی تریشەوە ئەمریكییەكان پشتی كۆنە هاورێیەكانیان بەردابوو، كە وەعدی پێدابوون كۆمەكیان بكات لەوانە (جونیفال هابیاریمانا) رواندی و (موبوتو سیس سیك)ی زائیری. كە رژێمی ماركسی بە سەرۆكایەتی (مانگیستو هایلی ماریام) لە ئەسیوبیا لەساڵی ١٩٩١ شكستی هێنا، زەبرێكی كوشندە بەر یاخیبووەكانی سودان دەكەوێت، كە لە ژێر چەتری بزاڤی میللی رزگاری سودان خەباتیان دەكرد، كە لە ئەسیوبیاوە كۆششیان بۆ رووخاندنی رژێمی خەرتووم دەكرد. لە ساڵی ١٩٨٣ەوە بە سەرۆكایەتی (جۆرج گارنگ) كە سەر بە عەشیرەتی دینكابوو، كە یەكێكە لە عەشیرەتە هەرە گەورەكان خوارووی سودان، سودان دووچاری شەڕێكی دژوارو خوێناوی ناوخۆ هاتبوو.

****

# سەردانێکی ناشەرعی

هەڵوەشانەوەی بزاڤی میللی رزگاری سودان هاوکات بوو لەگەڵ رووخانی مانگیستو، هۆکارەکەش دەگەڕێتەوە سەر رووبەرووبونەوەکانی نێوان تیرەو نەژاددکان و نەمانی کۆمەك و پشتیوانی ئەسیوبییەکان. لەولاشەوە حکومەتی سودانیش کارکەربوو بۆ لاوازکردنی بزاڤەکەو هێزەکەی بە شێوەیەکی بەرچاو سست و لاواز دەکرد. لەوددەمانە ئەمریکییەکان رژێمی سودانیان لە خەرتووم بە گەورەترین مەترسی لەسەر بەرژەوەندییە نابوورییەکانیان لە ئەفریقیا دەزانی، لە رۆژی یەکەمەوە کە بەرەی ئیسلامی میللی لە رۆژی ٣٠ی یونیۆی ساڵی ١٩٨٩ حکومیان گرتووتە دەست دژایەتی کۆشکی سپییان راگەیاندبوو.

رژێمی سودانی ببوونە دیواری بەرگری و توند بە رووی پرۆژەکانی ئەمریکی لە ئەفریقیا، بۆیەش ئەمریکییەکان جیرانەکانی سودانیان بۆ راپەڕاندنی پرۆژەکانیان بەکاردەهێنا، تا هێزی نەیارەکانیان کەم بکەنەوە، لەوددەمانەدا فرانس دکتۆر لە کۆتایی ئۆگستی ساڵی ١٩٩١ دەگاتە خوارووی سودان، لەگەڵ سێ ژوورنالیستی فەرەنسی لە وڵاتی کینیا چاوی بە پێشەوای خوارووی سودان جۆن گارنگ دەکەوێت. رژێمی سودانی سەردانەکەی حکومەتی فەرەنسی بۆ خوارووی سودان شەرمەزار دەکات، کە بە شێوەیەکی ناشەرعی سەردانەکەی کردووە، زووتر حکومەتی فەرەنسی دوو جار بەرەسمی داوای لە سودان کردبوو رەزامەندبێت لەسەر ئەو گەشتە، بەڵام ئەوان بواریان نەدابوو، بۆیە فەرەنسییەکان بەشێوەیەکی نایاسایی دەچنە ئەو وڵاتەو دەگەنە خوارووی سودان.

❊❊❊❊

## بە پێچەوانەی بۆچوونەکانی حکومەت

دکتۆر زیغموت ئوستروفسکی ئەو پیاوەی ماوەیەك لە ئیستخباراتی فەرەنسی کاریکردووە، یارمەتی کۆشنێری داوە دیمانەکەی لەگەڵ گارنگ سازبێت، ئەویش لە سەفەرەکەیدا هاوڕێیەتی کردووە، ئەودەمانە کۆشنێر سکرتێری دەوڵەت بوو، ئەویش لەو سەفەرەدا پەیوەندییەکی باش سازدەکات، لەودەمانەی (یونیی موسیفینی) دەگاتە دەسەڵاتی وڵاتی ئۆغندا دۆستایەتی لەگەڵ ئەمریکییەکان سازدەکات، ئەمریکییەکان یارمەتی سوپاکەی گارنگیان دەدا لەناو خاکی ئۆغنداوە دزەی ناو خوارووی سودان بکەن. ئیستخباراتی فەرەنسی زۆر جار کۆشنێریان لەوە ئاگادارکردیتەوە کەوا پەیوەندییەکەیان لەگەڵ دکتۆر زیغموت کێشەی سیاسییمان بۆ دروستدەکات. ئەو لە ناوەراستی مانگی دیسمبەری ساڵی ١٩٩٢دا لە پاریس جۆرج گارنگ و دکتۆر ئوساروفسکی دەبینێت، لەبەرئەوەی پەیوەندییەکانی سودان و فەرەنسا زۆر باش بوو، بۆیە ئەو کارەی زۆر باش لەسەری نەشکایەوەو قسەشی بۆ دروستکردبوو، پاریس و خەرتووم بەیەکەوە هاوسۆزبوون لەسەر گەشەو زۆربوونی بۆچوونی ئەنگلۆ _ ساکسۆنی لە ناوچەکە.

## قەیرانی سۆماڵ

کۆشنێر لە مانگی یونیۆی ساڵی ١٩٩٢دا بنکەیەکی مرۆیی لە نیرۆبی بۆ گەیاندنی پێویستییە مرۆییەکان و فریاکەوتن بۆ وڵاتانی ئەفریقی دەکاتەوە، لەو بوارەدا بایەخی بە ئاوارە سۆماڵییەکان دەدا، بە پاپۆرێکی فەرەنسی ٢٠٠٠ تۆن خواردەمەنی رەوانەی سۆماڵ دەکات. ئەو لە پاریسەوە بەرەو مقادیشو دەفرێت، لەوێ خۆی چاودێری گەیاندنی یارمەتییەکان

دەکات، بەڵام سۆمالییەکان بە لافیتەی (سۆماڵ بۆ سۆمالییەکان)و (یارمەتییەکان داگیرکردن ناگەیێنێت) پێشوازییان کردبوو، بۆیەش یارمەتییەکانی کۆشنێر زۆر لایەنی شاراوەی پێوەبوو، چونکە ئەو هەموو جارێك مافی دەستێوەردانیش لەو کارە مرۆیانە جێگای دەکاتەوە.

بەڵام کۆشنێر بەوەندە نەوەستاودو دایکوباوکی منداڵانی فەرەنسی و بەرێوەبەری قوتابخانەکانی هاندەدا منداڵەکان بەشداری بکەن لە هێنانی برنج بۆ منداڵانی سۆماڵ تا لە برسیەتی رزگاریان بکات، هەڵمەتەکەشی ناونـاوبوو (برنج لەپێناوی سۆماڵدا). منداڵانی فەرەنسا لە رۆژی ٢٩ ئوکتۆبەری ساڵی ١٩٩٢دا نزیکەی ٧٥٠ هەزار فەردە برنجیان لە قوتابخانەکان کۆکردیتەوە، هەر فەردە برنجێك کێشی ٢٠ کیلۆ برنج بوو، فەردە برنجەکانیش لە ٤٧ هەزار قوتابخانە کۆکرابوونەوە، هەر منداڵیکی فەرەنسی یەك کیلۆ برنجی بە ناوی منداڵانی سۆماڵ هێنابوو. پرۆسەکە بە رەزامەندی وەزارەتی پەروەردە کرابوو، دەزگای یونیسیف و پۆستە یارمەتیان کردبوون، توانرا نزیکەی شەش هەزار تۆن برنج کۆبکەنەوە، ئەوەش بەشی یەك مانگی منداڵانی سۆماڵی دەکرد. لەسەرەتادا بیرۆکەکە باش بوو بۆ هەستەجولاندنی منداڵانی فەرەنسی بۆ یارمەتی منداڵانی خواروو، بەڵام پاشان کێشەیەکی نایەوە، کەوا ناکرێ قوتابخانە علمانییەکان بۆ مەرامی سیاسی بەکاربهێنن. بەپێی مەڵبەندی توێژینەوەو راگەیاندن بۆ گەشەپێدان کە ٣٠ رێکخراوی بەرنامە خێرخوازی تێدا ئەندامە، رایانگەیاندبوو کەوا کارەکە ئەوە نیشان دەدات سیاسەتی دەوڵی ستەو ناتوانێت کێشەو شەڕەکانی سۆماڵ راگرێت، چونکە گرانی و برسیەتی ناو سۆماڵ لەئەنجامی بەربەرەکانی دوورودرێژی وڵاتەکەیە.

****

## ٦

# ئەو بەرگری لە هاوڕێیەکانی ناو بەرەی نیشتیمانی ڕواندی دەکات

پاش ئەوەی ئەو لەسەفەرەکەی سەراییڤۆ بوو، کەسە بەنازەکەی سەرۆك فرانسوا میتران کۆشنێر توانی پرۆسەی فەردە برنجەکانی سۆماڵ تەواو بکات. سەرەرای نارەزایی توندی وەزیری بەرگری فەرەنسی (بییر جۆکس) ئەو بۆ گەیاندن و دابەشکردنی یارمەتییە مرۆییەکان سەرپەرشتی دابەشکردنی سەربازە فەرەنسییەکانی کردبوو لە سۆماڵ، کە تێدا فەرەنسا لەگەڵ ئەمریکییەکان ئەو هەڵمەتەیان لەژێر دروشمی (گێڕانەوەی هیوا) لە سۆماڵ دەستی پێکردبوو.

بییر جۆکسی وەزیر زۆر تووڕەدەبێت و هێرشێکی توند دەکاتە سەر کۆشنێرو هەڵمەتە سەربازییە فەرەنسا لە سۆماڵ و دەڵێت:

(لەو جیهانەدا سی سۆماڵی تر هەیە، ئێمە بۆ ئەوانی تر هیچ ناکەین).

لێدوانەکەی بەو قسەیە کۆتایی پێهێنابوو کە وتبووی:

(من داوای یەك شت دەکەم، با هەر وەزیرێك لەلای خۆییەوە سەرقاڵی کاروباری وەزارەتەکی خۆی بێت، دەست لە کاروباری وەزارەتەکانی تر وەرنەدات. من دەست لەکاروباری چاکسازی نەخۆشخانەکان وەردەدەم...؟! من باسی مووچەی ژنە برینپێچەکان دەکەم...؟! یان باسی مەسروفاتی کەرت تەندروستی دەکەم...؟).

پاش کۆبوونەوەکەی ئەنجومەنی وەزیران جۆکسی وەزیری بەرگری وازهێنانەکەی دەنووسێت. کە سەرۆك میتران پەیامی دەست لەکارکێشانەوەکەی وەزیرەکەی دەبینێت بانگی دەکات، کەمێك ساردی دەکاتەوەو داوای لێدەکات لە حکومەتەکەی دوور نەکەوێتەوە.

کە وەزیرەکەو چەند سەرکردەیەکی تری سەربازی لە وەزارەتەکە بۆیان نەکرا بەرنامەکەی کۆشنێر لە سۆماڵ راگرن، بەیەکەوە کاریان بۆ ئەوە کرد، کۆشش بکەن، ئیتلزامی سوپاکەیان بە کەمترین زیان تەواوبێت، ژمارەی سەربازە فەرەنسییەکانیان لە سۆماڵ کەم کردەوەو داوایان لە ئەمریکییەکانی ناو سۆماڵ کرد، سەربازە فەرەنسییەکانیان لە مقادیشۆ بگوازنەوە شاری بیداوا، ئەگەر یەکە سەربازییەکانی ئەوان بگوازرێنەوە بیداوا، ئەوە ئەوان لەژێر کۆنترۆڵی فەرماندە ئەمریکییەکان نامینێن و مەترسییان لەسەر کەمتردەبێت. کۆشنێر بۆ گەیاندن و داگرتنی فەردە برنجە فەرەنسییەکان لە پاریس بەرەو مقادیشو بەرێدەکەوێت، پێش دەرچوونیشی ئەو لێدوانەی دابوو: (ئەو پرۆسە سەربازییە بە زووترین کات سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت، چونکە چەکدارەکانی بەرامبەریان تەنها چەکی رەشاشیان پێیە، هەموویان هەرزەکارن، تەمەنیان لە چواردە ساڵان تێپەر ناکات).

## کۆشنێرو فەردە برنجەکان

لە رۆژی ٥ی دیسمبەری ساڵی ١٩٩٢دا هەردوو کامیرای تی ڤی ١ و فرانس ٢ وێنەی کۆشنێریان لە سەر کەناری دەریا گرتبوو کە فەردە برنجی لەسەرشان بووە، وێنەکە وا دیاربوو ئەو لەناو ئاوەکە پانتۆڵی هەڵکردبوو و بە بارەوە دەرۆیشت. کرتەیەکی تری کۆشنێر بڵاودەکەنەوە کە فەردە برنجەکەی لەسەرشانە باسی قوتابیانی فەرەنسا دەکات، کە چۆن بەشە برنجەکەی ماڵەوەیان لە پشتی لۆرییەکان دادەنێن. رێکخراوە خێرخوازییە کارکەرەکانی ناو سۆماڵ لەگەڵ کۆشنێر بەشداری ویستەکانی ئەو نەبوون، چونکە ئەوان بەردەوام دەیانووت، کۆمەك پێشکەشکردن و چارەسەکردنی کێشەیەکی سیاسی بە کردەوەو یەکەی سەربازی سەرناکەوێت. کە کامیراو

ژوورنالیستان لە مەیدانەکە دووردەکەوتنەوە، پیاوەکانی دەریاوانی و سەربازەکان لە پاپۆرەکە دادەبەزن، لەوێ وەزیری تەندروستی و کاروباری مرۆیی وتبووی: (پرۆسەی گێڕانەوەی هیوا دەبێتە وەچەرخانێکی مێژوویی، بۆیەش ئەو پرۆسەیە لە داهاتوودا زۆرتر دەبێت و پرۆسەی تری بەدواوە دەبێت).

ئەو پرۆسەیە بووە سەرەتای بەکوشتندانی سەربازانی فەرەنسی لە خوارووی سودان و لیبیریاو مۆزنبیق و ئەنگۆلاو بۆرماو بۆسنەش.

سەرۆکی فراکسۆنی ئیشتراکی لە سالۆنەکانی کۆشکی بوربون، کە دیمەنەکانی تیمە سەربازییە فەرەنسییەکانی لەگەڵ تیمە خێرخوازییەکان لەسەر یەکێك لە شاشەکانی تەلەڤزیۆنی ئەمریکی دەبینێت، هێدمە (شۆك) دەیگرێت. (ئەندریە لاژووانیە)ی سەرۆکی فراکسیۆنی شیوعییەکانیش بەو دیمەنانە هەمان بۆچوونی دەبێت، ئەویش بەشداری سەربازیی فەرەنسی لە سۆماڵ سەرکۆنە دەکات و دەڵێت: (ئەو پرۆسە سەربازییە پارەی زۆری دەوێت، کە بەشی ئەوە دەکات چەند ساڵ منداڵانی سۆماڵی پێ نان بدەیت).

## ئاکامەکانی پرۆسەکە

سەرۆکی رێکخراوی پزیشکانی بێ سنوور (رۆنی برومان) پاش ١٥ رۆژ لە کشانەوەی سەربازە ئەمریکییەکان لە سۆماڵ، دەرئەنجامە سەرەتاییەکانی پرۆسەی گێڕانەوەی ئاشتی و ناردنی سوپا فەرەنسییەکە بۆ سۆماڵ لە نامیلکەیەکی بیست لاپەرەیی بەناوی (تاوانە مرۆییەکەی سۆماڵ) بڵاودەکاتەوە، لەوێیدا وتبووی:

(بۆ یەکەمجارو لەژێر ئاڵای کاری مرۆیی چەندین نادەمیزاد، نەك لە ژێر چەتری بەرگری شەرعییدا لە سۆماڵ کوژران، پرۆسەکەش بەرنامەیەکی

ڕێکخراو بوو بۆ تۆڵەکردنەوەبوو. لە وڵاتی سۆماڵ ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە، کەوا هێز چەند کوشندەیە ئەگەر حەقی لەگەڵدا نەبێت، ئەوەش زوڵمێکی گەورەو تاوانکارییە).

برومان ناردنی سوپا لەگەڵ یارمەتییە مرۆییەکان، بە هەنگاوی جێبەجێکردن و بەرجەستەکردنی مافی (دەستێوەردانی مرۆیی) دەزانێت، بۆیەش وتوویەتی: (ئەوەیە راڤەی پرۆسە سەربازییەکەی کە لە بەهاری ساڵی ١٩٩٢ کرا، ئەوەش پێشتخستنی هەموو ستراتیژییەکانی ترە، ئەوەش ڕووبەڕووبونەوەی درامییە لەنێوان توێژی منداڵان کە برسیەتی هەڕەشەیان لێدەکات، لەگەڵ کەسانێکی سڕکراو بە مادەی بێهۆشکەر).

ریجی دیبرایی، شارەزا لە کاروباری راگەیاندن، وێنەکانی سۆماڵی لە تەلەفزیۆنەکانی جیهانی لە ڕۆژنامەی لۆموند بە وێنەی کاریگەرو جەرگبڕ ناوبردبوو، لەوێیدا ئەو وتبووی:

(بەڵێ، ئەوەیان خەوی نەزڕاندم، شۆکی ئەو بینینە گچکانە، بە هەڵسوکەوتە مەردانەکان هاتنە پێشەوە).

خۆرهەڵات ئەو ڕۆڵەی بە شێوەیەکی زۆر باش بەرجەستەکردبوو، وا دەزانم پرۆسەکە بە ڕۆژانی سەرەتای کۆلۆنیالیزمی سەدەی رابردوو دەچوو. سوپاکەی بەرامبەر سەربازە ئەمریکییەکان و فرانس دکتۆر، چەکی کوشندەیان لەدەست نەبوو، سوپایەکی ڕێکخراو نەبوون، پیاوەکانیان سازو ئامادە نەبوون، بەڵکو سوپاکەی بەرامبەریان سکی بەتاڵ و برسی بوون، دەستیان بۆ یارمەتی و نان پاندەکردەوە، جیهانی سێیەم ترسناکە، بەو دیمەنانە بە وێنەی ژوورنالیستان سۆزو بەزەییان دەگەیاند.

*****

## کۆشنێر بایەخ بە رواندا دەدات

کۆشنێر لە سێ حکومەتدا پۆستی وەزیری تەندروستی و کاروباری مرۆڤایەتی لە حکومەتەکەی رۆکار، پاشان لە حکومەتەکەی کریسۆن و حکومەتەکەی بریگوفوریش پۆستی وەرگرتووە. ئەو حکومەتانە پشتیوانییان لە حکومەتی رواندی کردووە، تا یاخیبووەکانی توتسی سەر بە بەرەی نیشتیمانی رواندی بە زەبری چەك و شەڕ نەگەنە دەسەلآت. ئەو سێ حکومەتە چاودێری دانوستانەکانی نێوان رژێمی (جوفینال هابیاریمانا)و بەرەی نیشتیمانی رواندیی کردووە، کە رێکەوتنامەی ئەروشا رژێمی رواندیی ناچاردەکات بەرەی نیشتیمانی رواندا بەشداری بکات لە دەسەلآتەکەی ولآتەکەیان. لەودەمانەدا کۆشنێر سەعات بە سەعات و بەردەوامی بروسکەی دبلۆماسی تایبەت بە کێشەی رواندایی بۆ هاتووەو ئاگاداری ناوەرۆکی دانوستانەکەی ئەروشاش بووە. کۆشنێر لە رەوشەکەی رواندا ناگاداربوو، خۆشی دۆسێیەکەی دەناسی، ئەوەش لەبەر ئەوە نەبوو کەوا ئەو لە سەرۆك فرانسوا میتران نزیکە، لەبەر ئەوەش بوو کەوا ئەو لە (برونو دلای)یش نزیك بوو، کۆشنێر بێجگە لەو دوو پیاوی دەسەلآت لەگەڵ ژەنراڵ (کیسنو) لە سەرۆکایەتی گشتی سوپای سەر بە سەرۆکایەتی زۆر نزیك بوو.

## دیمانە لەگەڵ وەزیری تەندروستی رواندیی

برنار کۆشنێر لەودەمانەدا بە هیچ شێوەیەك لاری لە سیاسەتەکانی فرانسوا میتران نەبوو، کۆشنێر لە کوردستان و بۆسنەو سۆماڵ زۆرتر پروپاگەندەیی راگەیاندنی لە رواندا کردبوو. لەو ماوەی وەزیری تەندروستی و کاروباری مرۆیی بووە، ئەگەرچی لەبەر توندی هێرش و پێشرەوییەکانی سەربازیی بەرەی نیشتیمانی رواندیی هەزارەها هاوڵاتی ئاوارەو

دەربەدەربوون، ئەو لە بەرنامەکە لەوێ نەکتیڤ بووە، بەڵام یەك لێدوانیشی لەسەر رواندا نەبووە. زۆرجار داوا کراوە کۆشنێر کۆشش بکات مەرگەساتییەکەی کۆچبەرەکانی رواندا کەم بکاتەوە، بەڵام ئەو کاری نەکردووە تا وەزیرە هاوپیشەییە رواندییەکەی خۆی لە رۆما دەبینێت.

ئەو (کازیمیر بیزیمونگ)ی وەزیری تەندروستی رواندیی دەبینێت لە کۆبوونەوەی رێکخراوی تەندروستی جیهانی لە رۆما؛ وەزیرەکە بە درێژی باسی رەوشی زۆر خراپی کۆچبەرەکانیان بۆ دەکات، ئەویش ویژدانی دەجوولێت و بەڵێن بە وەزیرەکە دەدات یارمەتییان بدات و ئەویش داوەتی پاریسی بکات، پاش ئەو کۆبونەوەیەی وەزیری رواندیی و فەرەنسی، وەزیرە رواندییەکە پەیوەندی بە سەفیری وڵاتەکەیان لە پاریس دەکات، داواش دەکات سەردانی دیوانی وەزارەتی تەندروستی فەرەنسی بکات، لەگەڵ وەزیرەکەیان دیمانەیەك وەرگرێت. وەك چاوەڕوان دەکرا هەردوو وەزیرەکەی فەرەنسی و رواندیی لە رۆژی ١١ی دیسمبەری ساڵی ١٩٩٢ بە ئامادەبوونی سەفیری رواندیی (جۆن ماری نداجیجیمانا) لە پاریس دادەنیشن، ئەگەرچی دانوستانەکەیان زۆر گەرم بوو، بەڵام کۆشنێر هەر بە ناوی (برادەرە ئەزیزەکە) ناوی دەبرد، بەڵام لەو دانیشتنەدا رازی نەبوو ئەو سەردانی کیگالی بکات، بیانووی سەردان نەکردنەکەشی ئەوەبوو: (رواندا نەکارێت بۆ ئەو سەردانەمان رووماڵێکی فراوانی راگەیاندنی بۆ بکات، بۆیەش ئەو جۆرە سەردانانەش کاریگەری نابێت).

کۆشنێر بە بیر وەزیرەکەی رواندی دەهێنێتەوە کەوا ئەو چەند رۆژێك پێش ئێستا سەردانی سۆماڵی کردووە، وەفدێکی رۆژنامەگەری لەگەڵدابووە، ئەوانیش رووماڵێکی میدیایی زۆر باشیان کردبوو. پاش ئەو دیمانەیە چەندین دیمانەی تریش لە نێوان لایەنە بەرپرسەکانی ئەو دوو وڵاتە سازکرابوو، بەڵام پاریس بڕیارو گفتی ئەوەی نەدابوو، کارێکی مرۆیی بکات و یارمەتی کۆچبەرەکانیان بدات، بەڵام بۆ قەڵاچۆکردنی نەخۆشی نایدز بڕیاردەدات کۆمەکیان بکات.

## وێنەکان ... فرمێسکیان نەهێناوەتە خوارێ

کۆلۆنیل (فیلیب شاریی) لە فبرایری ساڵی ۱۹۹۳ لەگەڕانەوەی لە رواندا چەند وێنەیەکی سۆماڵییە دەربەدەرەکانی گرتبوو، دۆسیێەی وێنەکانی دابووە سەرۆکی دیوانی وەزیر، سەرۆکی دیوان پاش چەند رۆژێك پەیوەندی بە کۆلۆنیلەکە دەکاتەوەو پێیدەڵێت، پاش ئەوەی وێنەکانم رادەستی کۆشنێر کردبوو، ئەو وتبووی: (ئەو منداڵانەی لە بن دارەکە دانیشتبوون رەوشیان باش بوو، تەندروستییان زۆر سەڵامەت دیاربوو، بۆیە کەس بۆ ئەو وێنانە گریانی ناهێت).

وێنەکان لە ناوچەیەکی هەورازدا لە نزیك کیگالی گیرابوون، خەڵکە دەربەدەرەکان لە برسان گردەکە رووت دەکەنەوەو دارەکانیشیان بۆ ئامادەکردنی چێشت و خۆگەرمکردنەوە بەکارهێنابوو.

لە سەرەتای مارسی ساڵی ۱۹۹۳دا وەزیرەکە تەنها دکتۆرێکی ئاسایی بوو، بەڵام بەردەوامیش لە رۆژنامەکان ستوونی تایبەتی هەبوو. لە رۆژی ٦ی ئەپریلی ساڵی ۱۹۹٤دا مەسەلەکە دەگۆڕێت، لەو رۆژەدا فرۆکەی سەرۆك (جوفینال هابیاریمانا) دەخرێتە خوارەوەو بە کوشتنی ئەو لە رواندا کۆمەڵکوژی و مەرگەساتێکی مەزن بەرپا دەبێت و هەموولایەك هاواریان لێهەڵدەستێت، کەسانی داواکاری مافەکانی مرۆڤ و رۆژنامەنووسان و چالاکڤانانی بوارەکانی مرۆیی هاواردەکەن و نارەزایی دەردەبڕن لەسەر ئەوەی فەرەنسا پشتیوانی لە دیکتاتۆر هابیاریمانا دەکات، لەودەمانە کۆشنێر بێدەنگی هەڵبژاردبوو، ئەگەرچی مەسەلەکەش بە کۆمەکی مرۆیی و هاوکاری بە کەسانی دەربەدەریشەوە بوو.

ئەو زووتر لە گەڵ چەندین تۆڕی نزیك لە بەرەی نیشتیمانی رواندی لە پاریس نێوانی خۆش نەبوو، ئینجا هەر بێدەنگ دەبێت، ژنێك بەناوی (ئیما)

لــه ســەرەتای ئــەو ســاڵەدا ڕێکخراوێکــی بــەناوی ڕێکخــراوی ســوورفی دامەزرانـدبوو، کۆشـنێر لەگـەڵ ئـەودا پەیوەنـدی خۆشـی هـەبوو. ئـەو ژنـە بەنهێنی لەگەڵ دکتۆر نیمانویلیی و برنار کۆشنێرو ئەمنیستی ئەنترناشیونال ڕۆڵی دەبـینی، ئـەو پروپاگەندانـەی ئەودەمانـە ئـەو بڵاویـدەکردەوە، ئیمـڕۆ بوونەتــە ڕاســتی. لــەو ســەردەمەدا چەواشــەکردن و ڕووپۆشــین براگــەورەی هەڵوێـستەکان بـوو، وەك چـۆن سـەفیری ڕوانـدا لـە پـاریس (جـۆن مـاری نـدیجیلیمانا) کـاری بـۆ دەکـرد، ئـەوەی لـە حکومەتـە نوێیەکـەدا پۆسـتی وەزارەتی دەرەوەی ڕواندی بەردەکەوێت. لەودەمانـەدا برنـار کۆشـنێرو جـاك بیوزاقـارای نوێنـەری بـەرەی نیـشتیمانی ڕوانـدی لـە ئـەوروپا پەیوەنـدییان هەبوو. ئـەو سـەفیرە لـەناو خۆپیـشاندانێکی جـەماوەری لـە پـێش بارەگـای نەتەوە یەکگرتوودکان لە ژەنێڤ کۆشنێر ڕازی دەکات بـچێتە ڕوانـداو لـەوێ بۆل کاگامی سەرۆکی یاخیبووەکانی بەرەی نیشتیمانی ڕواندی ببینێـت، کـە بەچاوی سەرکردەیەکی میللی سەیری دەکردو ئەو دەتوانێت ڕژێمێکـی نـازی بگۆڕێت.

## بۆ جارێکی تر دەزگاکانی ڕاگەیاندن

بیوزاقارا هیوای بەوە هەبوو کەوا کۆشنێر بکارێت منداڵە یەتیمـەکان و گیراوەکانی توتسی ئازاد بکات، ئەوانەی لە هوتێلی میل کـۆلین ڕووبـەڕووی مردن دەبوونـەوە، کارەکـە زۆر گـەورەبوو، ئـەویش مەسـەلەی گواسـتنەوەی ٢٠٠٠ تا ٢٥٠٠ کەسی توتسی بوو.

برنار کۆشنێر دیسان وەك هەموو جارەکانی تری دەزگاکانی ڕاگەیانـدنی بـەکاردەهێنا، لـەو بـوارەدا سـەرێکی گـەورەی وەك (ڕۆنـو جـیرار)ی گـەورە نووسەری لوفیگارو لەگەڵدابوو، وێنەکانیش بـەکامیرای وێنـەگر (کریـستوف کلۆتز)بوون. کۆشنێر لەگـەڵ ڕۆژنامەنووسـەکەی لوفیگـارو دەگاتـە کمبـالا،

لەوێش بە ئوتومبێلێکی جۆری جێب دەگاتە مبرارا، کە ٣٠٠کم لە پایتەختەکەی ئۆغنداو ٦٠ کم لە سنووری رواندا دووربوو.

یاخیبووەکانی عەشیرەتی توتسی لەو شوێنەوە بۆ رووخانی حکومەت لە ئوکتۆبەری ساڵی ١٩٩٠ بەرێدەکەون، کەواتە مبارارا سەنگەرو پێگەی پشتەوەی توتسییەکان بوو، کە لەسەرەتاوە سەرۆکی ئۆغندی پشتیوانی دەکردن. شەوەکەی کۆشنێر لەگەڵ نوێنەری نەتەوە یەکگرتووەکان لە هوتێل دەمێنێتەوە، بۆ بەیانی لەگەڵ چەند سەربازێکی بەرەی نیشتیمانی رواندی بۆ دیمانەی بۆل کاگام بەرێدەکەوێت. لە رۆژی ٦ی ئەپریلی ساڵی ١٩٩٤ شەڕو پێکدادانەکان دژوارو گەرم دەبێت، لەو رۆژەدا بۆل کاگام فەرمان دەدات تەقە لەو فڕۆکەیە بکرێت کە سەرۆکی رواندی و بورندی تێدابوو. سەراپای کۆمەڵگای نیودەوڵی تێدەگەن کۆمەڵکوژییەکەی توتسییەکان و هوتوییە موعتەدەلەکان لە بەرەی رواندی چەند گەورەبوو، کە لە ژێر دەسەڵاتی سەربازە حکومییەکاندا بوو. لەولاشەوە ئەو کۆمەڵکوژییەی لە هەرێمەکانی ژێر دەسەڵاتی بەرەی نیشتیمانی دیموکراسی زۆر بە بێدەنگی بەڕێوەدەچوو، نە رۆژنامەنووسان و نە چاودێرە دەوڵییەکان باسیان نەکرد.

## دیمانەی بۆل کاگام

برنار کۆشنێر بە قەناعەتی تەواوی رەوایی مەسەلەی توتسییەکان گەیشتبووە رواندا. لەوێ لەگەڵ کەسێکی خوێنرێژی وەك بۆل کاگام لە رۆژی ١١ی مایۆ دیمانەی دەبێت. کە کۆشنێر دەگەڕێتەوە پاریس لەودەمانەی قسە بۆ ئاژانسەکانی هەواڵ و میدیاکانی فەرەنسی دەکات کەم و زۆر لەپەیامەکانیدا کە ئاراستەی رای گشتی دەوڵیش دەکات، باسی ئەوە ناکات کەوا بەرەی نیشتیمانی دیموکراسی بەرپرسی یەکەم و مەزنە لە کشانەوەی کڵاو شینەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان، بە ماوەیەکی کورت پێش دەستپێکردنی پرۆسەی قڕکردنەکەی کە لە رواندا روویدا. ئەو بە هیچ

شێوەیەکیش ئاماژەی بەوە نەداوە کە هاورێیەکانی لەو بەرەیە پاش گەیشتنی ئەو بۆ رواندا لەگەڵ بوونی هێزە نێودەوڵییەکان نین و دەیانەوێت و هیوادارن ئەو هێزانە تەنها لە خوارووی خۆرئاوای وڵات بن، ئەو ناوچەیەش دەکەوێتە ژێر چاودێری هێزەکانی رواندی، ئەوەشیان بە بەیانێك بڵاودەکەنەوە.

که کۆشنێر دەگەڕێتەوە پاریس لەسەر رووداوەکان ژمارەی ترسێنەرو قەبە بڵاودەکاتەوە کە لە رواندا روویداوە، وەك:

ژمارەی کوژراوەکان لە نێوان ۲۰۰ هەتا ۵۰۰ هەزار کەسە، تەنها ئەو لاشانەی لە شەقامەکانی کیگالی هەڵگیراونەتەوە دەگاتە ٦٠ هەزار تەرم، ئەو تەرمانەی بە رووباری ئاکاجیراش دەگاتە دوورگەی ڤیکتۆریا دەگاتە ۲٥٤٦۷ تەرم.

لەسەر شەپۆلەکانی رادیۆی فرانس ئانتردا کۆشنێر وتبووی:

(ململانێ و ناکۆکییەکان تەنها لەنێوان توتسی و هۆتودا نەبوو، مەسەلەکە سیاسییە، هۆتوییەکانیش خەڵکیان کوشتوە، ئەوانیش دەستیان بە کوشتنی هۆتوییە دیموکراسیخوازەکان کردبوو.. دەبێ ئەوە بزانن، لەبەرئەوەی ئەوان هۆتوییە دیموکراسیخوازەکانیان کوشتوە، کەواتە مەسەلەکە کوشتنی هیوای دیموکراسی بوو).

پرسیارێکیش دەکرێت، ئایا فەرەنسا لەو مەسەلەیەدا چ رۆڵێك بگێرێت...؟

کۆشنێر دەیویست لایەنگیری هاورێیەکانی لەناو بەرەی نیشتیمانی رواندی بکات، بەوەش شەرعیەتی تەواویان دەداتێ، بۆیەش زاراوەی (بەرەی میللی رواندی) لەجیاتی (بەرەی نیشتیمانی)یان بۆ بەکاردەهێنان، ئەوەش بۆ ئەوەبوو دەنگی نارەزاییەکان لەسەر رۆڵی فەرەنسی کەم بکاتەوە. لە ناوەراستی مانگی یۆنیوی ساڵی ۱۹۹٤دا کۆشنێر لەسەر داوای بۆل کاگام گەراوەتەوە رواندا، بەڵام هەواڵی سەردانەکەی بەو جۆرە بڵاودەکرێتەوە کەوا ئەو لەسەر داوای حکومەتی فەرەنسی ئەو سەردانەی کردووە.

٧

# كۆشش بۆ دۆزینەوەی رێگا چارەسەرییەك

هۆبرت فیدیرین کە لە حکومەتەکەی لیونیل جۆسپان وەزیری دەرەوە بوو، لە کۆڕێکدا کە لەسەر کێشەی بەربەرەکانێی کۆسۆفۆ لە مانگی فبرایری ساڵی ١٩٩٩ لە رومبویی گیرابوو، کە بۆ دەستنیشانکردنی رێگا چارەسەرییەك بۆ کێشەکە سازکرابوو. لەوێ ئەندامانی پەیمانی ئەتلەسی مەرجەکانی خۆیان فەرزدەکەن، دیارە سربییەکانیش ئەو مەرجانەیان قبوول نەبوو، وەك چۆن رۆژنامەنووسی ئەڵمانی (رودولف ئۆگستین) ئاماژەی پێکردووە، کەوا ئەمریکییەکان لە رومبویی مەرجی سەربازی وایان داناوە هیچ لە بەرپرسە سربییەکان پێیان قبوول نەبووە.

لە دیمانەیەکی تایبەتی نێوان برنار کۆشنێرو هۆبرت فیدرین لەوەدەمانەدا فرانس دکتۆری پێشوو، لە هوبرت فیدرینی وەزیری دەرەوەی ئەو کاتی فەرەنسا دەپرسێت:

_ ئایا تۆ لەگەڵ بۆمبابارانەکەدا نەبوویت...؟

لە وەڵامدا وەزیرەکە بە کۆشنێری وتبوو:

_ دەکرا ئەوە نەکەین، دەمانتوانی لە کاتی کۆڕەکەی روبویی ئیمزا لەسەر ئەوە بکەین.

کۆشنێر بە هۆبرت فیدرین دەڵێت:

_ لەگەڵ کێ... لەگەڵ میلوسوفیتشدا...؟

_ ئەودیان پێش دەستێوەردانەکە، هوشیاری دەولی لە مافەکانی مـرۆڤ، نەتەوەکان هەموو دەمێك کلیل بوون، بۆیەش هەر نەتەوەکان خۆیـان کلیلـی مەسەلەکانە نەك هەستی بینەرەکان.

بۆچوون و رامانی ئەو دوو پیاوە لەیەك جیاوازبوو لە نیگایان بۆ جیهـان و تێگەیشتن لە پەیوەندییەکانی نێوان نەتەوەکان. کۆشنێر هەموو شتێکی بە هەستێکی قووڵەوە دەبەستەوەو ئەوەشـی دەکـردە زەمینـەیـەك بـۆ بەرنامـە سیاسـییەکانی خـۆی. کۆشـنێر بۆچـوونەکانی فیـدرینی بـە گاڵتـەجاری و شەرمەزاری پێناسەکردووە، چونکە ئەو خوێندنەوەی بۆ واقیعـەکانی لەسـەر بناغەی زانینی مێژووەوە دەکرد، کە دەکارێت شرۆڤەی هـەموو حاڵەتـەکانی پێوە بکات.

ئـەو هەڵوێـستەی کۆنـە وەزیـری دەرەوەی فەرەنـسـی لـە پێـشبینییەکی تەقلییدی دبلۆماسییەوە سەرچاوەی گرتبوو، کە زۆریش سەلمێندرابوو، بـەڵام ئـەو وەزیـرەی کـە سـارکۆزی وەك وەزیـری دەرەوەی دەستنیـشانیکردووە، بەرنامە سیاسییەکەی لەسەر بنەمای (دابڕان)ەوە کارکەربووە، لەگەڵ هەموو مەترسییەکانی ئەو وشەیەو کاردانەوە ترسناکەکانیـشی لـەرووی پەیوەندییـە دەوڵییەکان و چارەسەری کێشە دەوڵییەکانیشەوە.

٥٨٥٧٤ جار هەڵسانی فڕۆکەکان لە ٧٨ رۆژدا لەسەر سربییاو کۆسـۆفۆ لە گوێیەکانی کۆشنێر دەنگی دایەوە، کە زۆر لـە خاڵـەکان لەسـەر بنـەمای نادیـاری چەواشـەدا دەپێکـران، مەبەسـتیش تـەنها بیـانووی شـەڕ هەڵگیرسانەکەبوو.

وەزارەتـی دەرەوەی بریتـانی لـە رۆژی ١٧ی یونیـۆی سـاڵی ١٩٩٩ رایگەیاندبوو کەوا لە کـۆی سـەد کارەسـاتی کوشـتارییدا لـە کۆسـۆفۆدا دە هەزار کەسی هاوڵاتی کۆسۆفۆیی بە دەستی سربییەکان کوژراوە، پـاش ئـەو بەیانـەی وەزارەتـی دەرەوەی بریتـانی، بیـل کلینتـۆنیش ژمارەکـەو کارەساتەکانی پشتراست دەکاتەوە.

کۆشنێر لەرۆژی ٢ی ئۆگستییدا دەبێتە نوێنەری تایبەتی سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ سۆراخکردنی گۆڕە بەکۆمەڵەکان، کە ژمارەی قوربانییەکانی ناو گۆڕەکان دەگەیشتە یازدە هەزار کەس، بەڵام لە هەمان رۆژدا دادگای لاهای راستی ژمارەی قوربانییەکانی بەدرۆ دەخاتەوە.
رۆژنامەی (باییس)ی ئەسپانی لە رۆژی ٢ی سپتەمبەردا وتارێکی بەناونیشانی (پۆلیس و یاساناسەکانی ئەسپان، هیچ بەڵگەیەکیان لەسەر کۆمەڵکوژییەکەی باکووری کۆسۆفۆ نەدۆزیوەتەوە) بڵاودەکاتەوەو هەروەها وتارێکی تریان بەناونیشانی (تاوانی شەڕ بەڵێ، بەڵام قڕکردن نەخێر) بڵاودەکاتەوە. لە وتارەکەدا نووسرابوو کەوا پشکێنەر (لۆبیر بالافوکس)ی بەرپرسی تیمەکانی گەڕان لە پۆلیسی زانستییدا وتبووی:
(ئێمەیان ناردبووە ئەو شوێنەی گوایە لە کۆسۆفۆدا، جەرگبڕترین شوێنە، تا لەوێ تەشریحی ٢٠٠٠ لاشە بکەین، کارەکانمان تا کۆتایی مانگی نۆڤمبەریش بەردەوامی دەبێت، بەڵام ئەوەی بۆمان دەرکەوت دەرهاتەکە بەپێچەوانەبوو، ئێمە تەنها ١٨٧ لاشەمان دۆزیەوەو گەڕاینەوە).
چاودێرێکی ئەمریکی لەسەر شەڕەکانی یۆگۆسلاڤیا وتبووی، ئەو شەڕانە هەموو بەرجەستەکردنی هەڵوێستە تایبەتییەکەی کۆشنێربوو لە بەرنامەی (دەستێوەردانی مرۆیی). ئەوەش دەستەواژەیەکی نوێی بە وڵایەتە یەکگرتووەکان بەخشیبوو، ئەویش ئەوەیان وەك شەرعییەتێك دەداتە پەیمانی ئەتڵەسی بۆ کارنامەی پاش شەڕی سارد، کە هەڤاڵبەندییە سەربازییەکانی دەهێڵێتەوەو تەمەنیشی درێژتر دەکات، بەتایبەتی لە دەڤەرە گەرم و تەنگەژەدارەکان.

****

## پاداشت

لەئەنجامی کارەکانی و ماندووبوونی لەو ناوچانەدا، وەك پاداشتی کارە مرۆییەکانی کۆشنێر دەکرێ بە کونسولی باڵای نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ئیدارەی کۆسۆفۆ، لە نێوان رۆژی ٢ی یولیۆ ساڵی ١٩٩٩ تا ینایری ساڵی ٢٠٠١ ئەو لەو پۆستەدا دەمینێتەوە، کە پەیمانی ئەتلەسی دەستنیشانیانکردووە. کۆشنێر مۆراڵە مرۆییەکانی خۆی بەوە نیشانداوە کە پشتیوانی لە قوربانییە ئەلبانییەکان کردووە. بەڵام دەرئەنجامەکان بە رووێکی کارەساتبارییەوە شکایەوە، چونکە کۆشنێر ناوچەکەی خستووتە ناو دەستە چەکدارەکان و چەتەکان، ئەوانەی نەتەوەکانی تر دەترسێنن، ئەوەی ئەلبانی نەبێت قبوولی ناکەن. لەوەدەمانەی کۆشنێر سەرقاڵی ئیدارەی مەدەنی کۆسۆفۆبوو، ئەمریکییەکان خەریکی دانانی بنکەیەکی گەورەی پەیمانی ئەتلەسی بوون کە لە سەربازگەی بوندستیل بەرجەستەیە، لە ناوەوەش بزاڤە کۆسۆفۆکانیان پڕ چەك دەکردو پشتیوانییان دەکردن.

❊❊❊❊

## بەرژەوەندی واشنتۆن

لەساڵی ٢٠٠٢دا کۆشنێر دەبێتە راوێژکاری دەوڵی بواری تەندروستی، ئەو وەك چۆن بایەخی بە ئەفریقیا داوەو کاریشی بۆ سازدانی تۆڕەکانی فەرەنسی پەیوەند بە ئەفریقیا کردووە، ئەو لە گۆڕەپانی سودانیش رۆڵی بینیوە، بەڵام ئەمجارە کارو بەرنامەکەی ئاراستەیەکی تر وەردەگرێت، ئەو دەڕوا بەرەو هەرێمێکی خۆرئاوای وڵاتی سودان، ئەویش دارفۆرە. لێرەو لەو کارەدا هاوبەشان و کارەکەرە لەگەڵ بەرژەوەندییە ئەمریکییەکان. لەگەل

هاتنەسەرکاری کۆمارییەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو کارەساتەکەی ۱۱ی سپتەمبەری ساڵی ۲۰۰۱دا نزیکبوونەوەیەك لەنێوان واشنتۆن و خەرتووم پەیدابوو، ئەوان هەڵوێستی دژە تیرۆرەکەی سودانیان بە هەند وەرگرتبوو. ئەگەرچی ئەمریکییەکان گەمارۆدانەکەی سەر سودانیان هەر مابوو، بەڵام ئەوان لەگەڵ تۆرە جاسووسیەکانی ئەمریکا هاوکاربوون. کۆشکی سپی هاوکاربوو لە سازدانی رێکەوتنی ئاشتی لەنێوان دەسەڵاتی سودانی و سوپای رزگاری سودان، بەیەکەوە رێکەوتنامەی (نیڤاشا)یان لە کینیاکردو لەوێدا ئەمریکا رۆڵی بەرچاوی هەبوو، کە لە ینایری ساڵی ۲۰۰۵دا لەگەڵ جۆن گارنگدا مۆرکرا.لەودەمانەدا دارفۆر بە گەرمی دەکوڵا، لەبەر چەند هۆکارێك شەڕی ناوخۆی خۆرئاوای سودان گەرم و دژواربوو، لەوانە وشکەساڵی و کەمبوونەوەی رووبەرە کەسکەکان، بۆیەش جووتیارەکانی ئەفریقی و بەدو کە زۆریان عەرەبن دەبێتە شەڕیان.

## پترۆڵی دارفۆر

ئەو هۆکارانەی سەرەوە تەنها هۆکاری شەڕە ناوخۆییەکانی دەڤەری دارفۆر نەبوو، شارەزاکانی پترۆڵ دەڵێن دارفۆر دەکەوێتە ئەو رووبەرەی پترۆڵی تێدایە، کە لە (ئاینید)ی تشادییەوە تا (کفرە)ی لیبی درێژ دەبێتەوە. ئەوەش گەنجینەیەکی زۆری ئەو زێرە رەشەی تێدا کۆبوویتەوە.

کەسانی چاودێرو چالاکوانەکانی بواری کارە مرۆییەکانی خێرخوازی دەڵێن، مەرگەساتەکان و کۆمەڵکوژییەکان لە نێوان ساڵانی ۲۰۰۳و ۲۰۰٤ زۆر دژوارو گەرم بوون، ئەو رووداوانە زۆر کار لە چەپی کریستیان و ئەنجلییەکانی ئەمریکییەکان دەکات، ئەوەو ئەنجومەنی ئەمریکی کە سەرپەرشتی دیواربەندی ئەمری هۆلۆکۆستی جولەکە لە نیویۆرکیش دەکات، لەگەڵ ۸۰ رێکخراوی تری مرۆڤدۆستانە کەوتبوونە خۆو کۆششیان دەکرد ئەو مەرگەساتە راگیرێت و کۆمەکیش بگاتە ئەو میللەتە

نێقەوماوەی دارفۆر، ئەوانە هەموو بەیەکەوەو بە پشتیوانی کۆنگرێسی ئەمریکی ڕێکخراوێکیان بۆ پاراستنی دارفۆر دامەزراند، ناویان نابوو (هەڤاڵبەندی لەپێناوی فریاکەوتنی دارفۆر)، کە لە ڕۆژی ١٤ی یولیۆی ساڵی ٢٠٠٤ ڕۆژی بوونی رادەگەیێندرێت.

لیستی ناوی ئەو کەسانەی پشتیوانی مەسەلەی دارفۆربوون دووردرێژە، ئەوانە هەڵمەتێکی راگەیاندن بوون بۆ رەوایی مافەکانیان و راگرتنی ئەو زوڵمەی لە دارفۆرییەکان دەکرێت، لەوانە (ئیلی ویسیل) هەلگری خەڵاتی نۆبلی ئاشتی، کە زۆر دۆستی نزیکی برنار کۆشنێریشە، هەروەها (برنار هنری لیڤی)و ستاری هۆلیۆد (جۆرج کلۆنی)و (ئەنجیلینا جۆلی)یش ڕۆڵیان بەرچاوبوو. ئەو هەڵمەتە راگەیاندنەی لەو مەسەلەیە کرا زۆر بێ وێنەبوو، لەو هەڵمەتەدا دعایەی زۆر بە مەبەست لەسەر ئالیاتی نەژادی و کولتووری دەکرا، وەك (عەرەبەکان رەشەکان سەردەبڕن) یان (ڕژێمی توندڕەو لە خەرتووم هاوڵاتیانی مەدەنی نەیاری شەریعەت دەکوژن).

## هەڵەی نارەزایی ئەمریکی

پاش هەڵمەتی نارەزایی ئەمریکییەکان، فەرەنساش دەستی بەو هەڵمەتەکردبوو، کە پێشنیارەکەش لە کۆمەڵەی فەرەنسی و یەکێتی خوێندکارانی جوولەکە لە فەرەنسا (ئیس ئو ئای راسیزم)و چەندین ڕێکخراوی ناحکومی و کەسایەتییە چالاکەکانی بواری میدیاو کارە مرۆییەکان، لە فەرەنسا لە ڕۆژی ٨ی فبرایری ساڵی ٢٠٠٥ کۆمەڵەی (فریاکەوتنی دارفۆر) دادەمەزرێت. لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٧دا کۆمەڵەی فریاکەوتنیان رایگەیاندبوو کە وا مانگانە ژمارەی قوربانییەکان گەیشتووتە ١٠ هەزار کەس، ئەوەش هەموو ژمارەکانی پێشووی قوربانی ڕێکخراوەکانی تری دەوڵی ناحکومی هەڵوەشاندەوە، کە زووتر بڵاویانکردیتەوە.

# کۆشنێرو فریاکەوتنی دارفۆر

کۆشنێر یەکێك بووە لە ستوونەکانی کۆمەڵەی (فریاکـەوتنی دارفـۆر)، پێش ئەوەی باس لە رۆڵی ئەو لەو رێکخراوە بکەین، با بەیەکەوە کەسایەتی و ئەندامەکانی تری ئـەو رێکخـراوە نـاس بکـەین، لەوانـە سـەرۆك (جـاکی مامۆ)و سەرۆکی پێشووی رێکخراوی پزیشکانی جیهان، ئەو رێکخراوەی کە کۆشنێر دایمەزراندبوو، ئەوەی کە پشتیوانیشی لە داگیرکردنەکەی عێـراقیش کردبوو، بەردەوامیش دژی مقاومەی فەڵەستینییەکانیش دەوەستا. سکرتێرە گـشتییەکەی کۆمەڵەکـەش (ریتـشارد رۆسـین) کـە ئەنـدامێکی پێـشووی رێکخراوی پزیشکانی جیهان بوو، هونەرمەندی فەرەنسی (دیـان شـانال) کـە بە رەچەڵەك ژنیکی سینگاڵ بوو، ئەندامی کارابوو، هەروەها کەسـایەتیەکی سـەربازی پێـشووش (برنـار شالـشا) کـە ئێـستا وەك کاریکاتێریـستێك لـە رۆژنامەی شارلی ئابـدو کاردەکـات و بـە کەسـێکی نـەیاری سـامییەکانیش دەناسرێت، ئەویش لەو رێکخراوەدا ناوی هەبوو. کەسـە چـالاکوانەکانی ئـەو کۆمەڵـــە لەوانـــە فەیلـــسوفە نزیکـــەکانی کۆشـــنێربوون، وەك (کانـــدری گلوکـــسمان)و (باســـکال بروکنـــز)، نـــابێ ئـــەوەشمان لەبیربـــچێت کـــەوا بەرێوەبەرەکەی شارلی ئابـدو (فیلیـب ڤـاڵ)یـان لەگەڵـدابوو، ئـەوەی لەگـەڵ ئەوەدابوو کە ئـازادی رادەبـڕین دەبـێ رەهابێـت، کـە پەیوەسـت دەبێـت بـە رەخنەگرتن لە موسلمان و کاسۆلیکەکان، کەواتە چاو لەو کەسانەش بپۆشـن کـە رەخنـە لـە ئیـسرانیلیش دەگـرن. بـە نیـسبەت کۆشـنێر چـوار رێگـا نەدەگەیشتوتە دارفۆر، ئەو وایدەزانی سودانیش پاش سۆماڵ و رواندا دێت، کۆشنێر وا دەزانێت ئەو فەرەنسایەی لـە داکۆکیکـەرە لـە مافـەکانی مـرۆڤ، ئیمرۆ هێزێکی ئامادە نییە لەسەر ئاستی ئەفریقیادا.

# قۆرخكردنی هەڵمەتەكانی هەڵبژاردن

دەستەی دامەزرێنەری ڕێكخراوی فریاكەوتنی دارفۆر هەموویان لە زۆر بابەتەدا بەرچاو ڕوونیان وەك یەك وابوو، جا چ لەسەر داگیركردنەكەی عێراق یان سیاسەتە دڕندەیەكەی ئیسرائیل بەرووی عەرەبدا. لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٧دا فەرەنسا سەرقاڵی هەڵمەتی هەڵبژاردنەكەی سەرۆكایەتی فەرەنسی بوو، بۆیەش كۆشنێرو هاوڕێیەكانی بڕیاردەدەن كارنامەی ڕێكخراوەكەیان بۆ بەرژەوەندی هەڵمەتی هەڵبژاردنەكە بخەنە گەڕ.

لەڕۆژی ٢٠ی مارسی ساڵی ٢٠٠٧دا، واتە دوو مانگ بەر لە هەڵبژاردنەكەی سەرۆكایەتی فەرەنسی، دەستەیەك لە كەسایەتی سیاسی و ڕووناكبیران و هونەرمەندان لە پاریس كۆبوونەوەو مەبەستیش لەو دیمانەیەدا دەیانویست پەیمانی ئیتلزامێك لە پێناوی دارفۆر بە كاندیدەكانی هەڵبژاردنەكەی سەرۆكایەتی فەرەنسی ئیمزابكەن. لەناو ئەو كۆبوونەوەیەدا كۆشنێرو هاوڕێیەكانی مەبەستیان بوو بیرۆكەی حەلی سەربازی و مرۆیی بۆ فریاكەوتنی دانیشتوانی دارفۆر، ئەوانەی بوونەتە قوربانی قڕكردنەكە بەرجەستە بكەن. لەوێیدا كۆشنێر ئەو وشە ترسناكە دەردەبڕێت، بەبێ هیچ بیانووێك دەڵێت: (ئەوە قڕكردن و كۆمەڵكوژییە یەكەم جارە لە سەدەی بیست و یەكدا ڕوو دەدات).

سەبارەت بەو باسەش ڕۆنی برومان دەڵێت:

(كۆشنێر لەو هەڵمەتەدا ڕۆڵی زۆر گرینگی گێڕاوەو ئەو مەكینەی هەڵمەتەكەبووە، كە لەو كۆبوونەوەیەدا گەورە كەسایەتیەكانی دونیای سیاسەت بەشداربوون، بەو شێوەیە توانی هەڵمەتەكە بەرەو ئەو ئاراستە ببات بۆ بەستنەوەی زاراوەی قڕكردن بە ململانێی دارفۆر).

كۆشنێر توانی ڕەوشێكی درامی دروست بكات، كە لە خەڵكەكەش بگەیێنێت كەوا مانگانە دە هەزار كەس لە دارفۆر دەكوژرێت.

# تەریککردنی ئە نجامە نێونەتەوەییەکان

کە کۆشنێرو کۆمەڵەی فریاکەوتنی دارفۆر باس لە قڕکردنەکەی دارفۆر دەکەن، ئەو ئەنجام و دەرخستنانەی لە لیژنە نێونەتەوەیی لەسەر ئەو کێشەیە بڵاوکرایەوە تەریکدەکەن و باسی ناکەن، کە لە لایەن قازی نیتاڵی (نینتونێو کاسیس) سەرۆکایەتی دەکرا، بە بۆچوونی ئەو سیاسەتە حکومەتی سودانی سیاسەتی قڕکردنی پەیرەو نەکردووە. کەسانی ئاگادارو شارەزا زۆرجار رەخنەیان لەسەر بیانوو و دەرخستەکانی کۆشنێرو هاوڕێیەکانی لەسەر ئەو مەسەلەیە هەبوو، لەوانە توێژەری فەرەنسی (جیرۆم توبیانا)ی شارەزا لە کێسی دارفۆر، ئەو لە لۆمۆندی رۆژی ١٣ی مارسی ساڵی ٢٠٠٧دا وتارێکی لەژێر ناونیشانی (ئەو شتانەی من لە دارفۆر بینیم)دا نووسیبوو، لەوێدا ئەو نووسیبووی:

(بەردەوام کۆشنێرو هاوڕێیەکانی دەیانەوێت ئەوەی لە دارفۆر روویداوە بە هۆلۆکۆستی جوولەکە، یان بە قڕکردنەکەی توتسی لە رواندا بشوبهێنن).

لە بەهاری ساڵی ١٩٩٧دا کۆشنێر دەیویست پردی هاوکارییە مرۆییەکان لە تشادەوە بپەڕێنێتەوە، بەوەش دەگەنە ناو مەدەنییەکان، تشاد وڵاتێکە لەژێر کاریگەری فەرەنسادایە، بۆیەش فرانس دکتۆر بەردەوام دەیویست ئەوە بە پاریس بکات کە لەناو خاکی ئەوانەوە هەموو جوولەو چالاکییەکانی دەست پێبکەن.

❊❊❊❊

# وریایی حکومەتی فەرەنسی

حکومەتی فەرەنسی لەو مەسەلەیە زۆر وریابوو، کۆشکی ئالیزێ و وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسی، لەوە تێدەگەیشتن کەوا ئەو ئاراستەیە لە خواستی ئەمریکییەکانەوە نزیکە، بۆیەش سەرۆکی ئەو کاتەی فەرەنسا جاك شیراك لەوەیان زۆر وریابوو، باش لە بەرنامەی ئەمریکییەکان حالّی دەبوو، وایدەزانی ئەوەیان خۆسازکردنە بۆ عێراقێکی تر.

لە رۆژی ١٠ی مایۆی سالّی ٢٠٠٧دا سارکۆزی لە هەلّبژاردنی سەرۆکایەتی سەرددکەوێت و کۆشنێریش دەکاتە وەزیری دەرەوەی فەرەنسی، ئەوەی لەسالّی ٢٠٠٣ەوە دەیووت من بەشداری لەهیچ حکومەتی چەپدا ناکەم، کە کۆشنێر دەبێتە وەزیری دەرەوەو زۆر بەخێرایی سەرۆکە دبلۆماسییەکەی فەرەنسا حالّەتی فریاکەوتن لە دارفۆر رادەگەیێنێت. دیارە بەرنامەی ئەو بەیانەش سازکردنی پردێك بوو بۆ گەیاندنی فریاکەوتنی مرۆیی بۆ ئەو ناوچەیە، هەروەها داوای کردبوو لەو ناوچەیەدا ناوچە دژە فڕین دیاریکرێت و کونسلیەتی دارفۆریش بکرێتەوە.

سودان رووبەرووی راستەوخۆی مافی دەستێوەردان دەبێتەوە، حکومەتی سودانی بە ساردی پێشوازی لە نوێنەری کێردورسی فەرەنسی (وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسا) دەکاتەوە، مەبەست لەو سەردانەش کردنەوەی پردە مروییەکەبوو لە تشادەوە. نەتەوە یەکگرتووەکان و سەرۆکی تشاد (ئیدریس دبی)یش لەگەڵ بەرنامەکەدا نەبوون، چونکە سەرۆکی تشادی لە دوارۆژی بیرۆکەکە لەسەر سستەمی رژێمەکەی دەترسا. کۆشنێر کۆششی دەکرد پشتیوانی زۆرو دەولّی سازبکات تا فەرەنسا بتوانێت کۆنگرەیەکی نێونەتەوەیی لەسەر دارفۆر سازبکەن، بۆ ئەو مەبەستەش لە رۆژی ٢٥ی یونیۆ بە ئامادەبوونی سەرۆکی فەرەنسی نیکۆلا سارکۆزی و وەزیری دەرەوەی ئەمریکی کۆندالیسا رایس کۆنگرەکە سازدەکرێت.

## ٨

## کۆشنێر مانگانە ژنەکەی بە نیو ملیۆن یورۆ دادەمەزرێنێت

لەو کۆبوونەوە دەوڵییەی پاریس سەبارەت بە کێشەو مەرگەساتەکەی دارفۆر سازیکردبوو، یەکێتی ئەفریقی و سودان بانگ نەکرابوون، بەڵام وڵاتی چین داوەتکرابوو، کە یەکێکە لە دۆستە هەرە نزیکەکانی سودان، بەڵام سەرکردەکانی وڵاتی چین وا بەئاسانی دۆستەکانی خۆیان لە خەرتووم شەرمەزار ناکەن، بێگومان بواریش نادەن سزاو گەمارۆشی بخرێتە سەر، چونکە خەرتووم ڕێژەی ٧٪ پێویستییە پترۆڵییەکانی چین دابین دەکات، چین بۆ سودان بنکەیەکی پتەوی سەرمایەگوزارییەی دەرەکییە، بوونی چین دەبێتە دیوارێکی بەهێز بۆ نەگەیشتنی ئەمریکییەکان بۆ ئەفریقیای ڕەش.

لەو کۆڕەدا بیرۆکەی دامەزراندنی هێزێکی ئەورووپی ئامادە لە تشادو ئەفریقیای ناوەراست دروست دەبێت، بەرنامەکەش بۆ پاراستنی ئاوارەکانی ناو ئەو دوو وڵاتەبوو کە زۆربەیان هاوڵاتی دارفۆربوون.

ڕاوێژکاری شەخسی برنار کۆشنێری وەزیری دەرەوە، (ئیریك شفالیی) ڕادەسپێرن بۆ سەرپەرشتی دۆسیێەی دارفۆر، داواشی لێدەکەن پەیوەندی بکات بە کۆمپانییە ئەورووپییەکان بۆ بەشداربوونیان لە هێزە ئەورووپییەکان، لەبەر گومانی هەندێ لە پایتەختە ئەورووپییەکان لەسەر پەیوەندی پاریس بە کۆنە وڵاتە کۆلۆنیە کۆنەکان، لەو مەسەلەیە هەڵوەستەیان هەبوو.

وەك چۆن بەرنامەی بۆ دانرابوو لە ڕۆژی ٢٥ی سپتەمبەری ساڵی ٢٠٠٧دا بڕیاری ژمارە ١٧٧٨ سەبارەت بە بەشداری و هاوکاری هێزە فرە ڕەگەزەکان لە سازکردنی بواری گەڕانەوەی کۆچبەرەکانی دارفۆر بۆ ناوچەکانی خۆیان دەردەچێت، مەرجە هەموو پێویستییەکیان بۆ دابین بکەن، ئەو بڕیارەش لە ماوەی تەنها یەك ساڵ کارکەربوو، بەڵام بڕیاردکە دوور بوو لە بۆچوون هیوایە هاوبەشەکەی هەریەك لە جۆرج بۆش و کۆشنێر.

## کارتی سوپای رزگاری سودان

کۆشنێر بۆ جێبەجێکردنی هیواکانی کارتێکی تری هەبوو، ئەویش بوونی پێشەوای سوپای رزگاری سودان (موحەمەد عەبدولوحید نور)بوو، کە ئەو یەکێك بوو لە سەرکردەی هێزەکانی دارفوربوو لە پاریس. ئەو کەسێکی کاریزمی بوو بۆ کۆچبەرەکانی دارفور، ئەو لە ٢٥ی فبرایری ساڵی ٢٠٠٧ نووسینگەیەکی سوپای رزگاری سودان لە ئیسرائیل دەکاتەوەو بوونی پەیوەندیشی بە ئیسرائیلەوە بەئاشکرا رادەگەیێنێت، بۆیەش دەوڵەتی عیبری رەزامەندی مانەوەی کاتی بە ٦٠٠ کەسی دارفوری لە ئیسرائیل دەدەن، ئەویش هاورێیەکی نزیکی کۆشنێربوو، یەکێك بوو لە هاورێیە هەر نزیکەکانی لەناو کۆمەڵەی (فریاکەوتنی دارفۆر).

کۆشنێر بۆ باسکردنی مەسەلەی دارفۆر لەگەڵ جۆرەها لایەن دیمانەی دەبوو، بەڵام لەوێیدا بە هیچ شێوەیەك ئامادەنەبوو باس لە چارەسەری سیاسی بۆ مەسەلە گەرمەکەی دارفۆر بکات. کۆشنێریش هاوسۆزبوو لەگەڵ واشنتۆن ئەو مەسەلەیە بکەنە بیانوو بۆ رووخانی رژێمەکەی خەرتووم.

## کارە شەرمەزارییەکەی ( ئاریش دو زویی )

لەگەڵ هەڵمەتەکەی کۆشنێرو کۆمەڵەکەی (فریاکەوتنی دارفۆر) سەبارەت بە قڕکردنەکەی دارفۆر، رووداوی ئاریش دو زویی دەنگی دایەوە، کە لە رۆژی ٢٥ی ئوکتۆبەر تەقیوەتەوە، پرۆسەکە بریتی بوو لە کۆشش بۆ دەربازکردنی ١٠٣ منداڵ بەبێ رەزامەندی دەسەڵاتدارانی تشادو کەسوکاری منداڵەکانیش. (تیری بریتو) لە کۆمەڵەی ئارش دو زویی خاوەن بیرۆکەکەبوو، کە هەمان رووداو لەلایەن کۆشنێرەوە لە بیاڤراو رواندا

روویانـدابوو، مەبەسـتیش دەربـازکردنی ژمارەیـەك منداڵـە لـە پرۆسـەی قڕکردنەکە.

بریتو پـێش نـەودی منداڵـەکان بـەرەو فڕۆکەکـە ببـات کـە لـە ئابیـشی چاوەڕوان بوو رادەگرێت. چیرۆکەکەو گۆیەندە راگەیاندنەکە چەندین پرسیاری هاوبەشی لەگەڵدایە کە وەڵامیەکانیان زەحمەتە. کەس ئەوە بڕوا ناکات کەوا دەسەڵاتدارانی فەرەنسا ئاگـادار نـەبووە لـەو بەزمـەی ئەنـدامانی ئـارش دو زونیـی خەبـەردار نـەبن...؟ ئەگـەر کارەکـە سـەری گرتبووایـەو منداڵـەکان دەگەیشتن کێ و چۆن پێشوازی دەکران...؟

## بڕیارەکەی ئۆکامبو

لە رۆژی ١٤ی یولیۆی ساڵی ٢٠٠٨دا قازی ئەرجنتینی (لویس مورینـو نوکامبو) سەرۆکی دادگای دەوڵی بەتاوانی جینوسـایدی هاوڵاتیـانی دارفـۆر بڕیاری گرتنی سەرۆکی سودانی (عومـەر حەسـەن ئەلبەشـیر) دەدات. پـێش دەرچـوونی بیرخەرەوەکـەی گـرتنی سـەرۆکەکەی سـودان، دانوسـتان لـەنێوان واشنتۆن و خـەرتووم هـەبوو، پرسـیارەکەش ئەوەیـە ئایـا ئـەو مەسـەلەیە وا بەرێکەوت بوو، یان بەرنامەرێژی بۆ کرابوو...؟!

کۆشنێر وەك کاردانەوەیەك لەسەر بڕیارەکەی دادگـا، داوا لـە ئەلبەشـیر دەکـات رێـزی بڕیارەکـەی دادگـای دەوڵـی بگرێـت، ئەنـدامانی کۆمەڵـەی فریاکەوتنی دارفۆریش هەمان داوایان لـە سـەرۆکی سـودانی کردبـوو. لـەناو کۆشکی ئالیزێش مەسەلەکە زۆر وریایانە وەرگیرابوو، حکومـەتی فەرەنـسی لەگـەڵ وڵـاتی قەتـەر کـەوتبووە دانوسـتان بـۆ لابردنـی بڕیارەکـەی گـرتنی ئەلبەشیر.

# بیانووەکەش (تۆ لەوێ بوویت)

تراژیدیاکەی رواندا بووە کێشەو خەمی برنار کۆشنێر، بیانووەکەشی ئەوە بوو، ئەو دووجار لەکاتی قڕکردنەکە لەوێ بووەو لەسەر داوای پۆل کاگام سەردانی کردوون. ئەو قسەیەی وەزیرەکە (من لەوێ بووم) ببووە قسەی سەرزاران، بەو بیانوویەش ئەو وەڵامی ئەو کەسانەی بەتوندی دەدایەوە، ئەگەر باس لە ئاسییکردنەوەی رەوشەکەیان لەگەڵ هاوڕێیەکەی دیکتاتۆری خوێنرێژ لە کیگالی کردبووایە.

لە دیمانەیەکی رادیۆییدا لەنێوان برنار کۆشنێرو جۆن بییر ئەلخباشدا کە لە رۆژی ١ی ئۆکتۆبەری ساڵی ٢٠٠٧دا ئەنجام درابوو، ئەو لە وەزیرەکە دەپرسێت، هۆکار چییە تۆ دەتەوێ لەگەڵ پۆل کاگام ئاشت بیتەوە...؟

رۆژنامەنووس ئەلخباش دەڵێ:

(یەك دوو، جینوساید...؟).

وەزیرەکە بە تووڕەییەوە وەڵامی رۆژنامەنووسەکە دەداتەوەو دەڵێت:

(بەرێزم جینوساید، لەوێ ئەو پرۆسەیە رووی نەداوە، میللەتە زۆرینەکە کە هۆتۆن، کەمینەی توتسییان کوشتوە، ئەوە لەوێ روویداوە، مەسەلەکە کارەساتێکە).

کە رۆژنامەنووسەکە لە کۆشنێر دەپرسێت، دەسەڵاتدارانی رواندی ئێستا چەند لە رووداوەکەی رۆژی ٦ی ئەپریلی ساڵی ١٩٩٤دا بەرپرسن، وەزیرەکە لە وەڵامدا دەبێژێت: (بەڵگەکان ئەوە ناسەلمێنن، کام لایەن بەرپرسن، ئەوان یان لایەنەکەی تر، دەکرێ لەسەر ئەو مەسەلەیە دانوستان بکەین، مەسەلەکە بەوە نەبەستراوەتەوە، من لەوێ بووم، ئێوە گوێم لێبگرن، من کەسێکی کەللەرەق و سەرسەختم، بەڵام کە لە سەر خوێن و کەللە سەری منداڵاندا رێ دەکەم، بۆیە قبوولم نییە رۆژنامەنووسان هیچ قسەیەك بکەن،

مـن لـەوێ بـووم، باشـم لـە بـیرەو دەزانم لـەوێ چ روویـداو چ قـەوما، مـن بانگەوازەکەی هاندانی کوشتنەکانیشم لەبیرە).

کۆشنێر بەردەوام دەیووت من لەوێ بووم، ئەو وشەیەی هەر لەسەر زاردا بوو، نەوەی ئەو دەیووت ١٣ ساڵ دادگای دادی دەوڵی سـەبارەت بـە رواندا هیچیان بۆ دەرنەکەوت. کۆشنێر دەیووت من لە قازی (بروغییر) زۆرتـر لـەو کێسە شارەزاو ئاگادارم، چونکە من لە کاتی جینوسایدەکە لـەوێ بـووم. لـە قسەکانی ئەودا ئەوە دیارە، کەوا ئەو مەسەلەکەی لە چیرۆکێك دەرهێنـاوە، وەك چۆن لە بیاڤراو لە بەلقان و ئەریتریاو عێراقیش کردوویەتی. ئەو لەنێوان خێرخوازەکـان و شـەڕخوازەکان، لـەنێوان قوربانییـەکان و جەلادەکانـدا، دەستبژێری دەکرد، ئەو توتسییەکانی کردبووە خێرخوازەکان و هۆتۆکانیـشی بـە خوێنرێـژو بکـوژ دەژمـارد، کـە لـە نازییـەکان نزیـك بـوون. لـە ئاکـاری کۆشنێردا تووڕەیی و فرمێسك تێکەڵدەبوو، کە باسی قڕکردنەکانی روانـدای دەکرد، لە دیمانەکەی ئەلخباشدا دیاربوو زۆر نارەحەت ببوو.

## هۆلۆکۆستی جوولەکە لە رواندا

ئـەو بـەردەوام کۆمەڵکوژییەکـەی روانـدای بـە هۆلۆکۆسـتی جوولەکـە دەشوبهاند، بۆیە وتوویەتی:(من لـە روانـدا تێگەیـشتم بۆچـی جوولەکـە لـە شەڕەکەدا دەکوژران، من دەپرسم بۆچی فڕۆکەکانی هاوپەیمانـەکان تۆڕەکـانی ترێنیـان نـەدەپێکاو هێڵـەکانی ئاسـنیان تێکنـەدەدا، کـە جوولەکـەیان پـێ دەگەیاندە ئوردوگاکان).

بـۆل کاگـام بەدەرچـوونی نیکـۆلا سـارکۆزی لـە هەڵبژاردنـەکانی سـەرۆکایەتییدا نوێنـەرێکی تایبـەتی خـۆی بـۆ خزمـەت سـەرۆکی کۆمـار دەنێرێت تا پیرۆزبایی دەرچـوونەکەی لێبکـات، مەبەسـت لـەو پیرۆزباییـەش شاردنەوەی دۆسێیەی قازی بروغییرو هەڵوەشاندنەوەی بیرخەرەوەی گرتنەکەی بوو کە قازییەکە بۆی دەرکردبوو.

که (ریتشارد سیزیبیرا)ی نوێنەرەکەی کاگام دەگاتە پاریس، چەندین کۆبوونەوە لەگەڵ کەسە باڵادەستەکانی فەرەنسی دەکات، چونکە ئەو زووتر سەفیربووەو لەکاروباری سیاسیی هەستیارەدا شارەزابووە. سیزیبیرا لەگەڵ فەیلسوف ئەندری گلوکسمان و هاوڕێیەکەی برنار کۆشنێر دادەنیشێت کە هەردووکیان هاوڕێی سەرۆکی رژێمە نوێیەکی رواندابوون.

لەو کۆبوونەوەیەدا هێشتا کۆشنێر پۆستی وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسی وەرنەگرتبوو، بەڵام ناوی لە گەڵ کەسە کاندیدکراوەکان بوو بۆ ئەو پۆستە، ئەو لەودەمانەدا بە سارکۆزی وتبوو، ئەگەر من پۆستی وەزارەتی دەردوە وەرگرم، من کۆشش زۆر دەکەم رەوشی نێوان پاریس و کیگالی ئاسایی بکەمەوە. پەیوەندییەکانی نێوان کاگام و کۆشنێر توندو زۆر کۆنە، هەردوولا بڕوایان بەیەکتری هەیە کە بەکەڵك یەکتری دێن و لەهەموو زەرووفێکدا دەگەنە هانای یەکتری. کۆشنێر لە مانگی مارسی ساڵی ٢٠٠٦ دەچێتە لای کیگالی تا ئەویش یارمەتی بدات بۆ ئەوەی ببێتە سەرۆکی رێکخراوی جیهانی تەندروستی، سەردانەکەی بەفیڕۆ نەچووو کاگام بەهەموو جۆرێك هاوکاری دەرچوونی ئەوی بۆ ئەو پۆستەکردبوو.

## کۆشنێر دەبێتە وەزیری دەرەوە

رواندا پەیوەندییە دبلۆماسییەکانی لەگەڵ فەرەنسا لەسەر کۆششی گرتنی سەرۆکەکەیان بەپێی داوای دادگای دەولی و سووربوونی قازی برغیبیر پچراندبوو، دادگاکە داوای گرتنی نۆ کەسایەتی زۆر نزیك لە بازنە تەسکەکەی سەرۆك بۆل کاگام کردبوو، کە کۆشنێر پۆستەکە وەردەگرێت زوو داوا دەکات پەیوەندییەکە ئاسایی ببێتەوە. کۆشنێر لە رۆژی ٨ی دیسمبەری ساڵی ٢٠٠٧ لە پەراوێزی کۆنفراسی لوتکەیی وڵاتانی ئەفریقی ئەورویی لە لشبونە سارکۆزی سەرۆکی رواندا دەبینێت، پاش پێنج رۆژ هەردوو سەرۆك ئەمجارە لە کۆشکی ئەلیزێ کۆدەبنەوە، لەو کۆبوونەوەیەدا بڕیار دەدرێت

پەیوەندییە دبلۆماسییەکانی نێوان فەرەنساو رواندا ئاسایی ببێتەوەو دووبارە کارە دبلۆماسییەکە لەنێوان ئەو دوو وڵاتە بگەڕێتەوە دۆخی ئاسایی جاران، ئەوەش بە بەیانێکی رەسمی رادەگەیێندرێت.

کۆشنێرو کاگام سی دەقە بەتەلەفۆن بەیەکەوە لە رۆژی ۲٦ی ینایری ساڵی ۲۰۰۸ قسەیانکردووە، سەرۆکی رواندای بە گەرمی پیرۆزبایی بە کۆشنێر وتووە بەبۆنەی وەرگرتنی پۆستی دەرەوەی فەرەنسا، وەزیرە فەرەنسییەکەش ئاماژەی بەو هەلە سیاسییانە داوە کە زووتر روویانداوە، هەروەها بە سەرۆکی رواندیشی وتووە کەوا فەرەنسا هەڵەی دەرحەق بە رواندا کردووە. پرسیار زۆر دەکرێ هۆکارەکان چین کەوا فەرەنسا داواکانی کیگالی قبوول کردووە، ئەوەش دوور لە کۆشنێرەوە...؟ وەڵامی بەشێکی ئەو پرسیارە شرۆڤەکردنی ئەو پێشودچوونە لەو وتارەدا دیارە کە لە رۆژنامەی لۆمۆندی رۆژی ۱۸ی ینایری ساڵی ۲۰۰۹دا بڵاوکراوەتەوە، لە وتارەکەدا ئاماژە بەوە دراوە، کەوا سارکۆزی سازکاری دەکرد بۆ ئامادەیی سازبوونی ئاشتی لە کیفۆ، ئەو دەڤەرەی دەکەوێتە خۆرهەڵاتی کۆماری کۆنگۆی دیموکراسی، کە لە ماوەی ۱۲ ساڵە بۆل کاگام داگیریکردووە. پێشنیارەکەی ئاشتی کە سارکۆزی پێشکەشیکردووە بریتییە لە بەشکردنی خاك و سامانەکە لە نێوان رواندا و کۆماری کۆنگۆی دیموکراسییدا، دیارە بۆل کاگام رێك چاوی لەو داوایەو لەو سامانەبوو.

## کریستین (شاژن)ی دەنگی فەرەنسا لە جیهان

ئەگەر ژنی وەزیرێك لە دەوڵەتێك کە حکومەتێکی گەندەڵ و بەرتیلخۆری بۆگەنی بەڕێوەی ببات بکرێتە بەڕێوەبەری گشتی راگەیاندنی بینراوو بیستراو هەموومان زۆر بەو کارە قێزەوەنە پێکەنینمان دێت، بەڵام کە ئەو کارەو ئەو دامەزراندنە لە وڵاتی ئێمەو لە فەرەنسادا روو دەدات پێکەنینمان ناهێت. کە ئەو ژنە گەورەترین پۆستی راگەیاندنی وەرگرتووە،

ئەو پۆستەی سەرپەرشتی هەموو دەزگاکانی راگەیاندن و کەناڵەکانی تەلەڤزیۆنی ئاراستەکراوی دەرەوەش دەکات، کێ دەوێرێت رەخنەیەك بگرێت، کی دەنگی دەردەچێت. سەرنووسەری رۆژنامەیەکی ئاسایی لە خۆرئاوای فەرەنسا وتبووی: دەبێ زۆر ئاگاداری خۆمان بین لەو ژن و مێردە، واتە لە کۆشنێرو ئوکرانت هوشیاری خۆمان بین، کە ئەو قسانەی کردبوو ئاگاداری ئەوەش نەبوو کە کۆشنێر چ جۆرە هەڵمەتێکی راگەیاندنی کردبوو بۆ چەسپاندنی ژنەکەی خۆی لەو پۆستە باڵایەدا.

زۆرکەس و لایەن لە گەڵ ئەوەدا نەبوون رۆژنامەنووس کریستین ئوکرانتی ژنی کۆشنێر ئەو پۆستە هەستیارو باڵایە وەرگرێت، لەوانە کەسە بەشدارەکانی کەناڵی تی ڤی ٢ مۆند، کە تێدا کارمەندە سویسرییەکان و بەلژیکییەکان و کەندییەکان و رێکخراوی جیهانی فرنکفۆنییەکانیشی تێدایە، ئەوانەی پێش بڕیاری دامەزراندنەکە بە هیچ شێوەیەك پرسیاریان پێ نەکرابوو، چونکە کەناڵی تی ڤی ٢ی تەلەڤزیۆنی بە هیچ جۆرێك و بە هیچ شێوەیەك دەنگی راگەیاندراوی وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسی نییە. چونکە سەرمایەکەو بەرنامەکانی بەپێی رێکەوتنامەیەکی دەوڵی بەرجەستەبووە.

## شۆکی دامەزراندنی ژنەکە

کە بڕیاری دامەزراندنی هاوسەرەکەی کۆشنێر بڵاوکرایەوە، فەرەنسییەکان بەو هەواڵە تووشی شۆك هاتن، ئەگەرچی زۆرینەی خەڵکەکە نەیاندەزانی مووچەکەی دەگاتە ٤٠ هەزار یورۆ، کە ساڵانە دەکاتە نیو ملیۆن یورۆ. کە کریستین ئوکرانت بەرنامەیەکی لە کەناڵی فرانس ٥دا لە کۆتایی هاوینی ساڵی ٢٠٠٧ پێشکەشکرد، هەموو لایەك رامانێکیان لا دروست بوو، قسەی زۆر لەسەر ئەو بەرنامەیە کرا، هەموو لەبەر خۆیانەوە دەیانووت، چۆن دەبێ ئەو بەرنامەیە بدرێتە ژنی وەزیرێك...؟

سەندیکای رۆژنامەنووسانیش لەلای خۆیانەوە لە هەڵگیرسانی ناکۆکی بەرژەوەندییەکاندا نیگەران بوون، ئەوەیان بە هەڕەشەیەك لەسەر میدیای دەرەوەی فەرەنسییان پێناسەکردبوو. هەمووتان لەگەڵ مندا هەست بەوە بکەن ئەگەر لە ئەمریکا رۆژێك مێردی کۆندالیسا رایس ببێتە سەرۆکی (دەنگی ئەمریکا) چ دەبێت. کە بڕیارەکە دەردەچێت وەزیری کولتووری فەرەنسی (کریستین ئالبانال) هیچ قسەیەکی نەبوو بیڵێت، بەڵام تەنها ئەوەندەی وتبوو: (مەسەلەکە پەیوەند نییە بەوەی بەرپرسەکە کێیە، چ ژنێکە، یان کەسایەتییەکە کێیە، بەڵام جۆری دامەزراندنەکە لەگەڵ بەختیارییەکی گەورەبووە. ئایا کێ لەو پرۆسەیەدا بەختیارە...؟ کەسە دامەزراوەکە یان کەناڵەکە...؟ یان فەرەنسا تێدا بەختیارە...؟ یان ئەو بەختیارییە بەر جیهانیش دەکەوێت...؟).

## ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ شەڕدا

کۆشنێر بەو شەڕەی لەسەر دامەزراندنی ژنەکەی لەو پۆستەدا، گوێ بە قسەکان نەدابوو. ئەو هەر ئەوەندەی وتبوو، دامەزراندنی کریستین ئوکرانت، دەستنیشانکردنی باش بوو، هەروەها وتبووی: (ئەو کەسێکی سەربەخۆییە، ئێمە ٢٦ ساڵە بەیەکەوەین، تەنها یەك جاریش دانوستان و گفتوگۆیەکی لەگەڵ مندا نەکردووە، من دڵنیام بە هەمان ئاراستە ئەو لەوێ کارەکانی بەڕێوەدەبات، کە ململانێی بەرژەوەندییەکان دەست پێدەکات من یەکەم کەس دەبم باسی دەکەم، من بە هیچ شێوەیەك دەستم نەبوو لە کاروباری راگەیاندنی بینراوو بیستراودا، بۆ ئەوەش سوێند دەخۆم. من نازانم بۆچی ژنان دەست لەکاردەکێشنەوە، من وا دەزانم ئیشەکان بە جوانی دەڕوات ئەگەر بەردەوام بن. من لێرەم تا وەڵامی رەخنەکانی ئێوە بدەمەوە، ئەو بڕیارانەش دەردەکەم کە خۆیان لەسەر حاڵەتەکاندا فەرزدەکەن).

سەندیكای رۆژنامەنووسانی فرانس لە رۆژی ٣ی فبرایری ساڵی ٢٠٠٨دا بەیانێك بڵاودەكاتەوە تێیدا ئاماژە بە خزمەتگوزارییە ئەمیرییەكان یان شاهانەكان دەدات، كە كریستین ئوكرانت لە مونتدای خانەنشینی رێكخراو لەلایەن سەندووقی پاشكەوتكراوەكان، لە بۆردو لە رۆژی ٢٦ی ئوكتۆبەری ساڵی ٢٠٠٧داو لە زانكۆی هاوینەیی لە (میداف) لە مانگی ئۆگستی ساڵی٢٠٠٧ سازیكردبوو، ئەو خزمەتگوزاریانەش پارەكەی درابوو. رۆژنامەنووسەكان وا دەزانن ئەو ژنە رۆژنامەنووسە سوودی لەو خزمەتگوزارییە وەرگرتووە، ئەوەش بە خراپی لەسەر كەناڵەكە دەكەوێت، مەسداقیەتی نامینێت، بۆیە سەندیكا داواكارە ئیجرایاتی سزایی لەسەر كریستین ئوكرانت بكرێت.

## سەرپێچییەكانی ئوكرانت

ئیدارەی فرانس ٣ نامەیەكی هەرەشەئامێز ناراستەی رۆژنامەنووس كریستین ئوكرانت دەكات، پاش ئەوەی لێدوانێك لە گۆڤاری لۆبوان لەسەر خزمەتگوزارییەكان ئوكرانت لە دەرەوەی كاری خۆییدا لە فرانس ٣ كردوویەتی بڵاودەكاتەوە. كریستین هەرگیز رێزی پرنسیپەكانی كەرتی گشتی كاركردنی نەگرتووە، دەبێ پرنسیپەكان چ بن...؟

لەهەموو پرنسیپەكان گرینگ تر ئەوەیە كەوا رۆژنامەنووسانی تەلەڤزیۆنە فەرەنسییەكان قەدەغەیە هاوكاری دەزگاكانی تر بكەن، ئەوەش دەكرێ ئەگەر سەرنووسەرەكە بە رەسمی بواری بدات و بە نووسین رەزامەندی بۆ سازبكات. ئەوەی سەرپێچی ئەو یاسایەش بكات راستەوخۆ دووچاری لێپرسینەوەی ناسایی و سزا دەبێتەوە.

كە باس لەو زانیارییەی سەندیكای رۆژنامەنووسان دەكرێت كەوا ئوكرانت خزمەتگوزاری لە كاتی كۆنگرەی ٣٤ی فیدراڵییە دەوڵییە لە بڵاوكراوە دەورییەكان كردووە، باسی ئەوە ناكەن كەوا ئەو كارە بە هاوكاری (ئود توین) بووەو سوودەكەش بۆ سەكۆی ژنان گەڕاوەتەوە.

## ٩

# ئەو بۆ هەموو لێدوانەکان نەشتەرگەرییەکی دەکرد، بۆیەش ناویان لەو نابوو بەڕێوەبەرە قەسابەکە

کریستین ئوکرانت نەك هەر پرنسیپەکانی راژەی گشتی دەشکاند، بەڵکو ئەو بەڵگەنامەی ئەرکەکانی پیشەیی رۆژنامەنووسی فەرەنسیشی دەبەزاند. ئەو مەرجی لەسەر رۆژنامەنووسان دانابوو نابێ پارە لە دەزگا گشتییەکان یان دەزگا تایبەتییەکان وەرگرن، پێیدەووتن بە پارە وەرگرتن وەزیفەو پەیوەندییەکانتان ئیستغلال دەکرێت.

سەرەرای ئەو مەرجانە، نەدەکرا بەرنامە ئەمریکییەکە بۆ کارکردنی رۆژنامەنووسان پەیرەو بکرێت، ئەوەش بە کریستین ئوکرانت کە سەرۆکایەتی رێکخراوی (فەرەنسای جیهان)بوو نەدەکرا.!

ئایا ئەو پارەی بۆ سازکردنی ئەو رێپێوانانەی ئوکرانت سازی دەکردن چەند بوون...؟ یەکێك لە ئاژانسەکان کە ئەو پێش چەند ساڵێك سەرپەرشتی دەکرد، ئاشکرایان کردووە کە بەرنامەکانیان بۆ سازکردنی کۆڕیك و بۆ ماوەی تەنها نیو رۆژ دەگەیشتە ١٨ هەزار یورۆ، دەبێ پارەی ئەوەش بخرێتە سەر بۆ کەسی دووەم کە یارمەتیدەری ئەو دەبوو.

مووچەکەی ئوکرانت لە مووچەکەی فرانس ٣ زۆرتر بوو، کە دەگەیشتە ١٠ هەزار یورۆ، ئەوەشی لە بەرنامەیەکی هەفتانە کە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی لەسەر شاشەی فرانس ٣ و بۆ ماوەی چەند دەقەیەك بوو زۆرتربوو، کە پێش ئەوەی ببێتە بەڕێوەبەری دەزگای فەرەنسای جیهان وەریدەگرت.

مانگانە ئەو مووچەیە دەخرایە سەر حیسابی ددزگای (ئەلکسندر نیس ، ئا) ئەگەرچی بەپێی سستەمی راژەی گشتی ئەو جۆرە پارەدانانە قەدەغەبوون. ئەو جۆرە رەفتارانە دەسەڵاتدارەکانی سەخڵەت و نیگەران

نەدەکرد، چونکە رادەستی کۆمەڵەیەك بەرژەوەندی ببوون و سوودەکەش دەگەڕایەوە لای بەرێز کۆشنێر. بیانووەکەش ئەوەبوو کەوا شاژن کریستین کەسێکی پیشەییە، با بەیەکەوەش سەیری جۆری پیشەیی ئەو خاتوونەو ئەو کەسەی هاوڕێیەتی ئەوی لەو کاروانەدا کردووە بکەین، چونکە نەزانراوە کەسێك هەبوو‌بێت باسی پیشە گەورەکەی ئەو بکات.

## بیرەوەری دڵ

کریستین پاش ئەوەی گۆڤاری لیکسپرس جێدەهێڵێت کتێبێك بەناوی (بیرەوەری دڵ) لەساڵی ١٩٩٧ بڵاودەکاتەوە، لەوێیدا پێناسەکە بەو جۆرەیە:

(رۆژنامەنووسێکی تەلەڤزیۆنییەو خەبات و کارنامەی ٣٠ ساڵەی خۆی دەگێڕێتەوە کە تەژییە لە سەرنێشەو پێداچوونەوە).

لە کتێبەکەدا باس لە کارەکانی چەند ساڵەی خۆی کردووە، بە نمونە هێنانەوەو بڵاوکردنەوەی وێنەی کەسایەتییەکان و باس لە دیمانەکان دەکات، کە زۆریان مێژوویین و لەو ساڵانەی رابردوو بایەخی خۆیان هەبووە. یەکەم دیمانە کە باسی کردووە، دیمانەی وەزیری یەکەمی شاهەنشای ئێران ئەمیر عباس هویدابوو، کە پیش لەسێدارەدانی و لەناو زیندانا لەساڵی ١٩٧٩ لەگەڵییدا سازیکردووە.

لەو دیمانەیەدا پێناسەی ئەو پیاوەی کردووە کەوا جیهانی دەرەوە ئەو پیاوە لەبیر ناکات، باسی ئەوەشی کردبوو کەوا بۆ سازکردنی ئەو دیمانەیە ئەستەنگی زۆری دیوە، کە لە کلینکێك کە کرابووە زیندان ئەنجامدرابوو، باس لەو کاردانەوە بەتەوژمەکەی کردبوو پاش بڵاوبونەوەی دیمانەکە. کریستین ئوکرانت لەو کتێبەدا باسی ئەزموونی خۆی لە کارکردنی لە تەلەڤزیۆنی ئەمریکی کردووە، بەتایبەتی لە بەرنامەی ٦٠ دەقەی کە لە ساڵی ١٩٦٨دا لە تەلەڤزیۆنی (سی بی ئیس)دا، کە لەودەمانە کەسێکی رەش یان کارمەندێکی ژنی تێدا نەبوو لە ناو لیستی رۆژنامەنووسە

دیارەکانی ئەو کەناڵەدا. ئەو باس لە بەرپرسەکانی کەناڵەکە دەکات، کەوا کەسانی بەدرەوشت بوون، بەڵام دان بەوەدا دەنێت کەوا کەسی زۆر پرۆفیشناڵ بوون. لە رووی پیشەییەوە دەکرێ بڕوای تەواو بەو ژنە بکرێت، ئەو هەرگیز گاڵتەش ناکات.

## گۆبەندێك لەسەر مووچەكەی

لە ساڵی ١٩٨١دا کریستینی هاوسەری کۆشنێر لە کەناڵی ئەنتان ٢ کار دەکات، ماوەیەکی کورتیش لە ئیستگەی یۆروب ١دا کاریکردووە، لەوێ هەواڵەکانی سەعات هەشتی بە نۆرە لەگەڵ (باتریك بوافر دارفۆر) پێشکەش دەکات، پاش ئەو کارە ئەو دەبێتە بەرێوەبەری جێگر لە کەناڵی تی ئیف ١ی فەرەنسی، بەڵام ئەو بڕیاردەدات کارکردنەکەی بگوازێتەوە کەناڵی دووەم کە پاشان لەساڵی ١٩٨٨ دەبێتە فرانس٢. لەبەرئەوەی مووچەکەی ئەو زۆر بەرز دەبێتەوە، بۆیە رۆژنامەنووسەکان ماندەگرن و ژنەکە ناچاردەبێت واز لەو کەناڵە بهێنێت. پاش کارکردنەکەی ئەو لە فرانس٢ دەچێتە گۆڤاری لیکسپرس، ئەگەرچی دەڵێت من شانازی بەو ستافە شکۆدارو گەورەیە دەکەم، بەڵام ئەو رۆژێکیان لەناکاودا ئەو ئیدارەیە جێدەهێلێت.

## فەشەلی ئەو لە فرانس٢ و لیکسپرس

من پێناسەو وێناکردنی کەسایەتی شاژن کریستین ئۆکرانت جێدەهێلم بۆ هاوڕێم فیلیب کۆهین تا وێنەی راستەقینەی پیشەیی رۆژنامەگەری ئەو بکێشێت، کە زۆر نزیك دەبێت لە راستی، سەرەتا فەشەلبوونی لە هەفتەنامەی (ئەورووپیان) کە بەئیمکانیاتی بەرزەوە بوویتە شەریکی لۆمۆند لەساڵی ١٩٩٨و پاشان فەشەلەکەی لە ئیدارەی لیکسپرس. کریستین

لەنیدارەی گۆڤاردکە سەرناکەوێت. کە ئەو لە بەڕێوەبردنی رۆژنامەکە سەرناکەوێت، کۆهین دەڵێت:

(من بە دڵنیاییەوە دەڵێم شاژن کریستین وەك لە ناوەکەیدا دیارە ئەو ژنە پێش هەموو شتێ ژنی تەلەڤزیۆنە، بەڵام ئەو کۆشش زۆر دەکات ئاستە میللییەکەی لە بەرنامەی سیاسییدا وەك پێشکەشکاری هەواڵەکان لە فرانس ۲ی ساڵی ۱۹۸۵ بمینێتەوە، بەڵام سەرناکەوێت، بۆیە ستراتیژیەتی فراس۳ بەرنامەکەی ئەو دەخاتە کاتێکی درەنگی شەوانە).

ئەو گوتبووی من بەرنامە سیاسییەکەم باش بوو، بەڵام فەرەنسییەکان بایەخ بە سیاسەت نادەن، بۆیە رەواجی نەبووە، بەڵام هۆکاری راستی سەرنەکەوتنی بەرنامەو کارەکەشی ماوەیەك بوو دەزانرا، ئەو دیاربوو کەوا کەسێکی تەقلییدی و ئاساییە، بەراورد بە رۆژنامەنووسەکانی تری فەرەنسی. ئەو لە دۆزینەوەی بیرۆکەو هەڵبژاردنی گۆشەیەك بۆ دۆزینەوەی بابەتەکان کارامە نەبوو، بەڵام ئەوەی لە قازانجی ئەودا ئامادەبوو، ئەو حەسانەی هەبوو زۆریش سوودی لەوە بینیبوو.

شاژن کریستین بە تێپەڕبوونی ماوەیەك گەیشتوتە ئاستێك، لەودەمانەی گۆڕین و لادانی هەر رۆژنامەنووس و بێژەرێك ئەگەر لە بەرنامەو هێڵەکە لابدات ئاسان نەبوو، بەڵام بۆ ئەو ژنە ئەوەیان نەستەم بوو. دەکرێ هەموو قسەیەك لەسەر ئەو ژنە بکەین، بەڵام رۆژنامەنووسێکی کارمەندو بە بەهرەیە، بۆیەش هاوکاردکانی دەبێ داوای بەختیاری بۆ بکەن لە بەرێوەبردنی فەرەنسای جیهان. ئەگەرچی وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسی وەسایەتی راستەوخۆی لەسەر راگەیاندنی دەرەوە نییە، بۆیەش (دەنگی فەرەنسا) دەنگی (ژنە بەرێزەکە) دەهێڵێتەوە، ئەگەر ئەوە زۆر نەخایێنێت، ئەوا بەردەوام دەبێت تا مێردەکەی کۆشنیر لە پۆستی وەزارەتی دەرەوە بمێنێت. ئەو ژنە دیدی تایبەتی لەسەر جیهاندا هەیە، ئەوەش رامانی کەسانی پارێزگارە نوێیەکانە، کە لەگەڵ ئەمریکییەکان هاوسۆزە، ئەوەش زۆر لە رامانی مێردەکەی نزیك و هاوسۆزە.

# کریستینی نەشتەرگەر

یەکێك لە یاریدەردەکانی کریستین نوکرانت ئەوەی ئەبیرە کە ئەو ژنە کە پۆستی بەڕێوەبەری گۆڤاری لیکسپرسی بەڕێوە دەبرد، ئەوددەمانە زۆر وشەی (نەشتەرگەرییەکی بۆ دەکەم)ی بەکاردەهێنا، ئەوەشی بەکاردەهێنا کە رۆژنامەنووسێکی لە ستافەکە دەردەکرد.

کریستین کە دەچێتە رادیۆی فەرەنسای دەوڵی فێردەبێت وشەی نەشتەرگەری بەکاربهێنێت، ئەو قسەکردن و هەڵسوکەوتەکانی جۆرێك بوو لە قەسابێك دەچوو، ئەو نەشتەرگەرییەی کە بۆ هاوڕێیە رۆژنامەنووسەکەمان (ریتشارد لابیڤیار) کردبوو، ئێستاش قسەو بەزمێکی لەسەرە. رۆژنامەنووسەکە نامەیەکی لە بەرێوەبەرە مونتدبەکەی رادیۆی فەرەنسای دەوڵی (جنوفیاف جویتزنغر) لە رۆژی ١٦ی یولیۆی ساڵی ٢٠٠٨دا بۆ هاتبوو، تێدا تاوانباری کردبوو کەوا ئەو درۆی بە زاری بەرپرسان کردووە. لابیڤیار لە رۆژی ٨ی یولیۆدا دیمانەیەکی لەگەڵ سەرۆکی سوری (بەشار ئەلئەسد) لە دیمشق کردبوو، ئەو دیمانەیە کە بۆ بەرژەوەندی ئیستگەی فەرەنسای دەوڵی و تی ڤی ٥ مۆند سازکرابوو، چونکە ئەو بۆ ئەو دوو دەزگایە کاریکردووە، دیمانەکەش پێش هاتنی سەرۆك بوو لە ١٢ی یولیۆ بۆ پاریس. ئەوە شەش ساڵە بۆ یەکەمجار سەرۆکی سوری دیمانەیەکی رۆژنامەگەری لەگەڵ ژوورنالیستێکی فەرەنسی بکات. بەڵام بەرێوەبەرە ژنەکە غویتزنغز وتبووی: (درۆیەکە دوو سەرەبوو، فلابیڤیار پێش ماوەیەکی پێویست و باش ئاگاداری ئیستگەی فەرەنسای دەوڵی نەکردووتەوە، دیمانەکەی بەتایبەتی بۆ تەلەڤزیۆنی تی ڤی ٥ مۆند کردبوو، بەڵام لەسەر حیسابی بەرژەوەندی ئیستگەی فەرەنسای دەوڵییەوە بوو).

کە رۆژنامەنووسەکەی بانگکردووە، وایزانیوە مەسەلەکە گاڵتەیە، بەڵام نوێنەری سەندیکاکەیان لەو دەگەیێنێت کەوا داواکردنەکەی مەسەلەیەکی

جدییە، بۆیەش داوای لێدەکات. ئەگەر دەخوازیت هاوکاریت دەکەین. ئەو تەمەنی پەنجا ساڵ بوو، سی ساڵە ئاسنامەی ژوورنالیستی لە گیرفاندا بوو، لە ینایری ساڵی ٢٠٠٠دا لەلایەن (جۆن بۆل کلۆزال)ەوە دەکرێتە بەرپرسی بەشی دەوڵی، پێش ئەوەی ببێتە بەرهەمهێنەرو پێشکەشکەری بەرنامە هەفتانەکەی (جیوپۆلیتك) پاشان نووسینی سەروتاری پێدەسپێرن.

## هەڵمەتێك بۆ راونانی رۆژنامەنووسان

لابیڤیار نووسەرێکی گەورەی گۆڤاری (نون)یش بوو، کە تەلەفزێونی سویسری (تی ئیس ئار) دەریدەکرد، وەك پەیامنێری وەکالەتی هەواڵەکانی فەرەنسی لە لیمای پایتەختی بیروفیا کاریکردووە. لە رۆژانەی شۆرشەکەی سندینییەکان لە نیکاراگوا رووماڵی رۆژنامەگەری کردووە، پاشان دەبێتە پەیامنێری بەردەوامی تەلەڤزێونە سویسرییەکە لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە ژەنێف و لە نیویۆرکدا، لەپاش ساڵی ١٩٨١ەوە ماوەیەکیش سەرقاڵی کاروباری جیهانی عەرەبی و ئیسلامی دەبێت، بۆیەش کتێبێك لەسەر (ئوسامە بن لادن) و تۆرەکانی جیهادی لە ساڵی ١٩٩٩ دەردەکات. پاش ئەو کتێبەو شارەزابوونی لە پێشهاتەکانی ئەو دەڤەرە، وەك لێزانێك لەکاروباری خۆرهەڵاتی ناوەراست بەتایبەتی سوریا کاریکردووەو چالاك بووە. لەو بوارەدا ئەو چەند کتێبێکی تریش دەردەکات. لەپاش کۆبوونەوە لوتکەییەکەی نێوان ئەسەدو کلینتۆن لە ساڵی ١٩٩٤ لە ژەنێف زۆرتر خەریکی کاروباری سوری دەبێت. ریتشارد خاڵ بە خاڵ وەڵامی ئەو نامەیە دەداتەوە کە ئاراستەی کرابوو، بە وردی باسی سەربردەی سازکردنی ئەو دیمانەیە دەکات، کەوا سەرۆکی سوری بەشار ئەلئەسد ماوەی سێ ساڵ بوو وەعدی بەو دابوو کەوا دیمانەیەکی لەگەڵدا سازبکات. بۆ سازکردنی دیمانەکە سەرۆکایەتی سوری مەرجی ئەوەیان هەبوو کەوا دیمانەکە بە نووسین بێت، هەروەها مەرجی ئەوەشیان دەبێت کەوا دیمانەکە هاوکات لە ئیستگەی

فەرەنسای دەوڵی و لەسەر شاشەی تی ڤی ٥ مۆند بەیەکەوە بڵاوبکرێتەوە. رۆژنامەنووسەکە لە وەڵامەکەدا کۆتایی بەو شێوەیە پێهێنابوو کە نووسیبووی: (من دووبارە نەوە دەڵێمەوە من تێناگەم بۆ ئەو کاردانەوەتان هەبوو، من وا دەزانم رێزی پرنسیپەکانی پیشەکەم گرتووە، ئێستگەی فەرەنسای دەوڵی توانی بیکاتە دیمانەیەکی تایبەتی، بۆیەش وا لە دەرئەنجامی داواکەم لێپرسینەوەم لەگەڵدا دەکەن).

وەك چۆن کاری بۆ کرابوو هەردوو کەناڵەکە دیمانەکەیان بڵاوکردەوە، بەڵام کەناڵە تەلەڤزێونییەکە زووتر دیمانەکەی بڵاوکردیتەوە، لەوەشدا ئیدارەی بەرهەمهێنانی ئەو دوو کەناڵە بەرپرسن، نەك رۆژنامەنووسەکە. لە رۆژی ٢٣ی یونیۆی ساڵی ٢٠٠٨دا دووبارە لابیڤیار نامەیەکی تری لە غوتزنغز بەدەست دەگات، تێدا داواکارە بەدوای پەیامی دەرکردنەکەی بکەوێت، لە رۆژی ٦ی ئۆگستی بانگی ئەنجومەنی تەندیبکردنیش دەکرێت.

بەڵام تەسەور بکەن چ روویدا، لە رۆژی ١٥ی ئۆگستییدا دوو ئەندامی سەندیکاکەو لە کاتی گێرانی ئەنجومەنە تەئدیبییەکەی نامەیەکی رۆژی ١١ی ئەو مانگەیان دەستدەکەوێت، کە تیدا باس لە ئەنجومەنەکە دەکات پێش کاتی بەستنی ئەنجومەنەکە، کە تێیدا هاتبوو: (لەو کۆبوونەوەیەدا ئێمە ئامادەی ئەنجومەنە تەئدیبییەکە بووین و گوێمان لە بەرگرییەکەش راگرت، بۆیەش ئەنجومەنەکە بڕیاری خۆی دەرکردووەو بە دەرکردنت ئاگادارت دەکاتەوە، چونکە تۆ هەڵەیەکی گەورەت کردووە..!).

لەژێرەوەی پرۆژەی نامەکەدا ناوی (ئالان بوزیلاك)ی بەڕێوەبەری گشتی راگەیاندنی وەزارەتی دەرەوەش هاتووە.! دەبی چ جۆرە قسەیەك بکرێت کەوا بڕیارەکە پێش دانیشتنی کۆبوونەوەی ئەنجومەنەکە دەرچووبێت، ئەوەی رێکەوتنامەی هەمەلایەنی رۆژنامەنووسان دایدەرێژێت، یان یاسای کار...؟ بێگومان ئەنجومەنەکە هیچ وەڵامێکی لەسەر ئەو بابەتە نەبوو، بەڵام بڕیاری دەرکردنەکە لە رۆژی ١١ی مانگی ئۆگستی بووەو نامە موسجلەکەش درابووە دەست ریتشارد لابیڤیار تێدا بڕیارەکەیان تێگەیاندبوو.

## دەرکردن لە مۆنتی کارلۆو فرانس٢٤

کریستین ئوکرانت و ئالان بوزیلیاك بەهەمان شێوەو بەرنامە بەردەوام بوون لە دەرکردنی رۆژنامەنووسێکی تر بەناوی (فریدیریك دومۆن) ئەوەی لە ساڵی ٢٠٠٦ لەگەڵ (وەلید شەرارە) کتێبێکیان بەناوی (حزبی اللـە، بزاڤێکی ئیسلامی نیشتیمانی) دەرکردبوو. ئەو رۆژنامەنووسێکی ناسراوو دیاری رادیۆی فەرەنسای دەوڵی بوو، بەردەوام لە بەیروت کارکەربووە، لەکاروباری خۆرهەڵاتی ناوەراستیش شارەزابوو. ئەنجومەنی ئەندیبی بڕیاری دەرکردنەکەی دومۆن تەنها لەبەر ئەوە بووە کەوا دەسەڵاتەکەی بە ناڕەوا بەکارهێناوە، ئەوەیان گرینگ نییە، بەڵام ئیدارەی ئیستگەکە دەرکردنەکەی ئەو بە بیانووی ئەنجامدانی هەڵەیەکی گەورە ناودەبات.

بەهەمان شێوەش ئیستگەی مۆنتی کارلۆ بەشە عەرەبییەکەی ئیستگەی فەرەنسای دەوڵی، خەڵکی تری لە ستافەکەی خۆییدا دەرکردووە، مەبەستیش لە کەسێکی وەك (وەهیب ئەبو وسیل)ە، ئەو رۆژنامەنووس و نەقابییەی بە ڕەچەڵەك فەڵەستینییە، لەپاش ئەو جێگری بەڕێوەبەری گشتی (مەحمەد بن جبور)و سکرتێری گشتی (کاترین کالفت)و بەڕێوەبەری پەخش (دانیال ئەلبرسینی)یش لیستەکەش ماوەو چاوەڕوانی کەسانی تریش دەکەین، کە لەو دەزگایەدا لەسەرکار دەربکرێن.

چەندین رۆژنامە لەسەر ئەو بابەتە رامانیان هەبوو، لەوانە (ماریان)و (لۆمانیتی)و (لۆکانار)و (ئونشینی)و (بولیتیس)و (لۆمۆند دبلۆماتیك)و (ئەفریك ئازی)، پێش ئەویش (سەفیر)ی لوبنانی و (وەتەن)ی جەزائیریش. لابیڤیار لەسەردانەکەی بۆ بەیروت کە سەرۆکی نەقابەی رۆژنامەکان (محەمەد بەعلبەکی) داوەتی کردبوو، لەوێ بەدرێژی قسەی بۆ رۆژنامەنووسە لوبنانییەکان کردبوو. ئەو کارەی ئوکرانت و ئالان بوزیلاك لە ئیستگەی

فەرەنسای دەوڵی بەوە کۆتایی نەهاتووە، تا گەیشتووتە فرانس ۲٤یش، قوربانییەکەی ئەو جارە بەڕێوەبەری نووسین (غریغوار دونیو)و سەرنووسەر (برتراند کۆك) بوون، کە پێش چەند ساڵێك کتێبێکی لەسەر برنار کۆشنێر بەناوی (ناڕەحەتیەکانی برنار کۆشنێر لە یۆگۆسلاڤیادا) بڵاودەکاتەوە، دوا ناوی کەسە دەرکراوەکانیش گەیشتووتە (یولیس گوسیت).

ئەوەی لە هەموویان ترسناك تر بوو، کە کۆشنێر بڕیاردەدات راگەیاندنی دەرەوە لە وەزارەتی دەرەوە دەکاتەوەو بە وەزارەتی ناوخۆو کولتووری دەبەستێتەوە، ئەوەشی بۆ ئەوەبوو تا باس لە بوونی ململانێی بەرژەوەندییەکان نەکرێت، بەڵام بەرژەوەندییەکانی ئەو ژنەو مێردە، کۆشنێرو نوکرانت لەپیش بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت و وەزارەتی دەرەوەشە.

## دیمانەیەك بە ۱۰ هەزار یورۆ

ئەوەش هەموو مەسەلەکان نییە کە شیاوی باس بن، کە خاتوون (لۆکانار نونشینی) دەزانێت بەڕێوەبەی راگەیاندنی دەرەوەی فەرەنسی (ئالان بوزیلاك) هێشتا رەگەزنامە بلژیکییەکە ماوە، دەڵێت ناکرێ کریستین نوکرانت کە ئەویش رەگەزنامەکەی بەلژیکییە، ببێتە بەرپرسی دەزگایەکی راگەیاندنی گشتی، بۆیەش بەو شێوەیە وەڵامی دەدەنەوە:
(ئەگەر نابێت، ئێمە لە ئەنجومەنی ئیدارە کۆدەبنەوەو یاساکان دەگۆڕین).
لێرەدا ئێمە مەبەستمانە بڵێین، هاوسەری کۆشنێر رەگەزنامەی بلژیکی هەیە.

کریستین نوکرانت بەڕێوەبەری دەزگای فەرەنسای جیهانەو مووچەی مانگانەکەی دەگاتە ٤٠ هەزار یورۆ، بەڵام کە بۆ گۆڤاری باری ماتش دیمانەیەك لەگەڵ (ئەنغرید بتونکور) دەکات، کە بڕیاربوو لە کۆلۆمبیا

بیکات، خۆشی ئەوەی لەسەر لاپەڕەی یەکەمی گۆڤاردکە وتووە، بەڵام نە پاریس دیمانەکە سازددکات، ئەو مەرج لەسەر گۆڤاردکە دادەنێت کەوا ١٠ هەزار یورۆی لە بەرامبەر ئەو کارە وەرگرێت، بەڵام ئەوان کەمێك پارەکەی پێ کەمدەکەنەوەو تەنها ٦ هەزار یورۆی بۆ سەرفدەکەن. کە سەرنووسەر ریتشارد لابیڤیاریش دیمانەیەك لەگەڵ سەرۆکی سوری دەکات و پەخشی بەرنامەکە لەلایەن ئیستگەی فەرەنسای دەوڵی تێکەڵدەبێت، ژوورنالیستەکە لەکار دەردەکرێت.

ئالان بوزیلاك مەسەلەکە لە رۆژنامەی لیبراسۆن روونەدەکاتەوەو دەڵێت: ئەو مەسەلەیە لەنێوان ریتشارد لابیڤیارو کریستین نوکرانت نەبوو، ئەوەش رەتدەکاتەوە کەوا کەسی دووەم پەیوەندی بە مەسەلەکەوە هەبووبێت. سەیر بکەن چۆن بە دوو شێوەو بە دوو فاقانە مامەلە لەگەڵ ئەو دوو کەسە کراوە، کریستین دیمانەیەکی بۆ باری ماتش کردووە، ئەگەرچی خۆی لە ئیستگەی فەرەنسای دەوڵی بووە، بۆ ئەو ئاسایی بوو، بەڵام لابیڤیار دیمانەکە سەری دەخوات. رۆژنامەنوسێکی تریش دیمانەی لەگەڵ ئەلئەسەدا کردبوو، بۆ بەرژەوەندی دوو دەزگای راگەیاندنیش. بەڵام دیارە کەوا بەراورد لەگەڵ شاژن کریستینی رۆژنامەنووسی گەورەو ئازادو پیشەیی و سەربەخۆ لەگەڵ رۆژنامەنوسێکی ئاسایی ناکرێت!

* * * *

١٠

# ئەو سوود لە پۆستی وەزارەتی تەندروستی لەسەردەمی جۆسپان دەبینێت

رۆژێ لــە رۆژان کۆشــنێر کەســێکی گــرینگ نــەبووە، بــەڵام کــارە خۆبــەختکارەکانی کــە یەکێکــە لــەو ســێ ئامانجــەی رێکخــراوی پزیــشکانی جیهانی کە لە پێناوییدا دامەزراوە، مەبەستەکانی ئــەو دەپێکێــت، لەوێیــدا ئەو دەردەکەوێت کەوا کارەکانی هاوشێوەی هەڵسوکەوتەکانیەتی، ئــەو ١٠ هەزار فرنگی فەرەنسی وەك خەڵاتی (پزیشك) لە گۆڤاری ئابراکت میدســان لە ســاڵی ١٩٧٩ وەردەگرێت و پارەکەش دەداتــە رێکخراوەکــەی پزیــشکانی جیهان. بەو شێوەیە ئەستێرەی پرشنگداری کۆشنێر دەدرەوشێتەوەو زۆر ناوی لەبواری فریاکەوتن دەردەکەوێت، لــەو رۆژەوە فەرەنــسییەکان هەســت ناکــەن ئەو پیاوە گۆڕابێــت، بۆیــەش دەبێتــە کەســێکی زۆر نــاودارو ناســراو لەســەر ئاستی جەماوەرییدا.

لەو رۆژەوە ترێنی ژیانی ئەو ژن و مێــردە، کۆشــنێرو کریــستین بــە لاری دەڕوات، ئەگــەر جلــی یەکپۆشییەکەشــیان وەك یــەك نــەبوو، کۆشــنێر جلــی سواری مرۆیی سپی لەبەردابووەو کریستینی هاوسەریشی جلی رۆژنامەگەری پسپۆری لەسەر شێوازی ئەمریکی پۆشیوە. هەردووکیان خۆیان بــە رەووشــت و سەرەتاییەکانی کۆمار گرێداوە، بەڵام وا دیارە بازرگانیشی پێوە دەکەن.

# (توتال) له میانماردا

لەساڵی ١٩٩٤دا کۆشنێر دەبێتە نوێنەرێکی ئەوروپی لەناو لیستێك کە (میشال رۆکار) پێشەوایەتی دەکرد، ئەو لە حکومەتەکەی جۆسپان لە ساڵی ١٩٩٧دا دەچێتە ناو حکومەت، لەو حکومەتەدا پۆستی سکرتێری دەوڵەت و هاوکاری تایبەت بە پۆستی تەندروستی وەردەگرێت، بەڵام پاش مانگی یولیۆی ساڵی ١٩٩٩ واز لەو پۆستەو لە حکومەت دەهێنێت، ئەرکی سەرپەرشتی ئیدارەی کۆسۆفۆی پێدەسپێردریت و پاشان وەك وەزیری تەندروستی دەگەڕێتەوە ناو حکومەت. ئەو کە دەبێتە وەزیر، دیارە کەوا مووچەکەی بەرزەو ئەگەر هەر کەسێکی تری خاوەن بڕوانامەی زانکۆش چەندین ساڵ کار بکات ناگاتە ئەو مووچەیە، بەڵام فرانس دکتۆر تەنها بە دەمەتەقێ ناو تەلەفۆنەکان دەگاتە ئەو پۆستەو ئەو مووچەیە. لە مانگی دیسمبەری ساڵی ٢٠٠٢دا لەگەڵ کریستینی هاوسەری سەردانی میانمار دەکات، ژنەکە وەك پەیامنێری تایبەتی گۆڤاری (ئەل) ئەو سەردانە دەکات، مەبەست لەو سەردانەش سازدانی وێنەیەکی رۆژنامەگەری بوو بۆ پێشەوای ئۆپۆزسیون (ئانگ سان سوکی)، کە کۆشنێر لەو سەفەرەدا دەگەڕێتەوە یەکێك لە پارێزەرانی کۆمپانیای توتال، ئەویش (جۆن ڤای)بوو کوڕی ژنە هاوڕێیەکەیان سیمون ڤای داوای لێدەکات هاوکارییان بکات لە سازکردنی شرۆڤەیەك لەسەر چالاکییەکانی بواری تەندروستی و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای پترۆڵی لە میانماردا. کۆنە وەزیرەکە دووبارە و لە ٢٥ی مانگی مارسی ساڵی ٢٠٠٣دا دەگەڕێتەوە میانمار، لەوێ سەردانی بنکەی (یادانا) دەکات، کە بواریان داوە توتال ببێتە پێشەنگی لیستی سەرمایەگوزارییە بێگانەکان لەو وڵاتەدا. پاش ئەو سەفەرەو بە گەڕانەوەی ئەو بۆ پاریس کۆشنێر وتارێك لە لۆمۆندا دەنووسێت. کۆشنێر ئەوەی باش دەزانی کەوا هەموو دەزگا خۆرئاواییەکان بایکۆتی ئەو دەستە سەربازییە دەسەڵاتدارەی

میانمار دەکەن، کە ژنە سەرکردەکەی ئۆپۆزسیونەکە لە وڵاتدا دەگیرێت هەموو ئەو دەزگایانە وڵاتەکە جێدەهێڵن و دەڕۆنەوە، کۆتاییەکەی بەوە دێت کەوا کۆمپانیای بریتانی ئەمریکی (تابوکو)ش بڕوات. کۆشنێر لەوە ئاگاداربوو کەوا ژنە قازی (نانتیر) کە یەکێك لە یارمەتیدەرانی ئەو بووە لە دیوانەکەی، تەحقیقێکی لەسەر تاوانی دەسبەسەرداگرتنێکی کۆمپانیای توتال کردیتەوە، ئەگەرچی یاسای فەرەنسی ناچارکردنی تاك لەسەر کارکردن بە تاوان نازانێت.

هاوڵاتیانی میانمار لەسەر ناچارکردنیان بۆ کارکردن شکایەت دەکەن، ئەوەش دەڵێن ئەو کارکردنە بۆ دابینکردنی سەلامەتی بۆڕییە پترۆڵییەکان نییە، تۆتال خۆیان ئەوە دەکەن، بەڵکو کارکردنەکە بۆ دروستکردن و سازکردن. لە راپۆرتەکەیدا کۆشنێر داواکارە کۆمپانیای توتال جەخت لەسەر پێویستی پرۆسەی دیموکراسی و گەشەپێدانی لەو وڵاتەدا بکەن، هەروەها داواش بکەن سەرکردە گیراوەکانی ئۆپۆزسیونیش ئازادبکەن، لەسەر کۆمپانیا بێگانەکان وا توندو رەق نەبن. راپۆرتەکەی کۆشنێر راستەوخۆ لە ماڵپەڕی توتال بڵاودەبێتەوە، سەرپەرشتکارانی ماڵپەڕەکە بەو جۆرەش پێناسەی نووسەرو ئامادەکاری راپۆرتەکە دەکات: (ئەو پیاوە کەسێکی سیاسی ناسراوەو لەگەڵ ئانگ سان سوکیش ناسیاریان هەیە، ئەویش ناوی برنار کۆشنێرە، ئەزموون و بەهرەی ئەوەی تێدایە وەك رەخنەگرێکی بابەتییانە لەسەر چالاکییەکانی توتال لە میانماردا بۆچوون و رووماڵی هەبێت).

بەرنامە کۆمەڵایەتییە ئابوورییەکەی کۆشنێر باشترین و جوانترین شێوەبوون بۆ ناوبردنی کۆمپانیای توتال، ئەویش دوودڵ نەبووە لەوەی باس لەو پێشێلکاریانە بکات کە هاوڵاتیانی میانمار رووبەڕووی کۆمپانیاکەی دەکەنەوە، کەوا خەڵکی ناوچەکە ناچار دەکەن کاریان بۆ بکەن، بۆیەش ئەو لە راپۆرتەکەیدا نووسیویەتی: (وەرشەکە کاری بۆ ٢٥٠٠ کەس دابینکردووە، هەموویان کۆنتراکتیان لەگەڵدا کراوەو مووچەکانیان رێك و

دیارە، ئەو مووچەخۆرانەش پاراستنی کۆمەڵایەتیش دەیانگرێتەوە).ئەو قسانەش پێچەوانەی ئەو بەرنامەیە بوو کە لە سەرەتاوە بانگهێشتی بۆ کردبوو. کۆشنێر بۆ تەواوکردنی راپۆرتەکەی ٢٥ هەزار یورۆی وەرگرتووە، کە بریتی بووە لە ١٩ لاپەرە، بۆیەش زۆر لایەن لەو هەڵدەگەرێنەوە، لەوانە فیدراڵیەتی مافەکانی مرۆڤ کە دەزانێت کۆشنێر ئەو جۆرە کارانەی کردووەو ناوی ئەو کەتووتە پەیوەندییە گشتییەکانی کۆمپانای توتال، نارەحەتی نیشاندەدات، چونکە ئەو دەزگایە دەیتوانی کارو گرفتەکانی خۆی لەناو ساڵۆنەکانی دادگاکاندا چارەسەر بکات. کۆشنێر بەناچاری وەڵامی ئەو تومەتانە دەداتەوەو بە رۆژنامەکان رادەگەیێنێت کەوا ئەو لەسەر بەرنامەو قسەکانی خۆی بووەو توانیویەتی دەقێك لەنێوان (دلای داما)ی پێشەوای رۆحی تبتەکان و ئانگ سان سۆکی مۆربکات.

## بە سەرۆکایەتی ئەو چالاکییەك بۆ دەزگای ئایستر دەکرێت

کۆشنێر بریاردەدات پسپۆریی لە راوێژکارییە تەندروستییەکان وەرگرێت، لەو رۆژەوە دەست دەداتە چالاکییەکی پیشەیی تر، ئەوەش دەبێتە تەواوکەری کارەکانی پێشووی لە وەزاردت، ئەو وایدەزانی ئەوەیان نەك تەنها بۆ سەدان خوێندکار باشە، سوودی بۆ هەموو مرۆڤایەتیش دەبێت، کە دەتوانێت کاتەکانی خۆی بۆیان تەرخان بکات، کە لەگەڵ کاردکانی وەزارەتدا وانەش بە خوێندکاران بڵێتەوە. راڤاران لە رۆژی ٢٢ی نۆڤمبەری ساڵی ٢٠٠٣دا فەرمانی بەرێوەبەربردنی سەرۆکی دەزگای ئایستری بۆ ئەو دەردەکات، ئەو دەزگایە ناوەکەی (بەیەکەوە بۆ هاوکاری تەندروستی)یە.

ئەو پۆستە هاندەرێکی نوێ دەبێت بۆ فرانس دکتۆر، ئەو کە لە فرۆکەیەکەوە دەچێتە ناو فرۆکەیەکی تر، لە کیشوەرێکەوە دەگاتە کیشودرێکی تر. ئەوەش خەونەکانی کۆشنێر تەواو ناکات، لەو شوێنەوە ناوەستێت، لە رۆژی ٨ی ینایری ساڵی ٢٠٠٤دا کۆمپانیای تایبەتی خۆی

بەناوی (بی. ك) بۆ سەرمایەگوزاری بە سەرمایەی ۳۰۰۰ یورۆ دادەمەزرێنێت، پارەکەش کاش لە بانك دادەنێت.

لەو رۆژەوە کۆشنێر بە ناوی سەرۆکی دەزگاکەی ناستری گشتی سەر بە وەزارەتی ناوخۆی فەرەنسی و سەرۆکی دەزگای کۆمپانیا تایبەتییەکەی خۆی لە بواری سەرمایەگوزارییدا، بەدوای بڕیار بەدەستەکانی کەرتی تەندروستی لە وڵاتانی خوارووددا دەگەڕێت، بەتایبەتی وڵاتانی ئەفریقی.

ئەو وەزیرانەی تەندروستی، کە دیمانەیان لەگەڵ کۆشنێرا بۆ سازدەبوو، لە کەرتی تەندروستی داوای کۆمەکیان لە وەزارەتی فەرەنسی دەکردو رێنماییشیان لە کۆمپانیا تایبەتییەکەی کۆشنێریش دەخواست. کۆشنێر لە رۆژی ۱۹ی ینایری ساڵی ۲۰۰٤ راڤاران دەبینێت، مەبەست لە دیمانەکەش دانانی بەرنامەیەك بوو بۆ چالاکییەکانی دەزگای ئایستر، پەیامی دانیشتنەکە زۆر روون بوو:

(فەرەنساو وەزیرە یەکەمەکەی پشتیوانی تەواوی کۆشنێر دەکات، بۆ قەڵاچۆکردنی نەخۆشی ئایدز).

کۆشنێر لەچەندین لایەکەوە نامەی پشتگیری دەگاتە دەست، لە خوارووو و لە باکووردوە نامەی بۆ رەوانە دەکرێت، هەر لەو کۆبوونەوەیەدا چەندین کەسانی خەمخۆری ئەفریقی لەو بەرنامەیە بەشداری کۆبوونەوەکان دەکەن، لەوانە (جان فرانسوا ماتی)، ئەوەی پاش کۆشنێر پۆستی وەزارەتی تەندروستی پێدەسپێردرێت و وەزیری مونتدب بۆ یارمەتی (بییر ئەندریولتزر)یش هاوکاری و پشتیوانی بۆ دووپاتدەکەنەوە. هەر لەو کۆبوونەوەیەدا نوێنەری حەوت دەوڵەتی باکووریش ئامادەدەبن، کە مەبەستیان بوو لە بەرنامەکەی کۆشنێر بەشداربن، لەوانە وڵاتانی: ئەمریکاو ئەڵمانیاو بریتانیاو سویدو نەمساو بەلژیکاو پرتوگال، هاوشانی ئەوانەش چەندین رێکخراوی دەوڵی نوێنەریان ئامادەبوو، لەوانە رێکخراوی تەندروستی جیهانی.

# سەفقەکانی ئەو لەگەڵ گابون

یەکەم دەرکەوتنی کۆشنێر وەك کەسێکی راوێژکار لەرۆژی ١ی یولیۆی ساڵی ٢٠٠٤ بوو، سەرۆکی گابون (عومەر بونگو) نامەیەك ناراستەی کۆشنێر دەکات، تێدا داواکارە پێش هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی ساڵی ٢٠٠٥ کۆششێکیان بۆ بکات بۆ رزگارکردنی سیستەمی تەندروستی وڵاتەکەی. کۆشنێر لەسەر داوای سەرۆکەکەیان بە چەندین پێشنیارو پرۆژەی چاکسازییەوە دەگاتە لیبروفیلی گابون، بەڵام سەفەرەکەی کۆشنێر لەژێر چەتری نووسینگەی ئایمیدابوو، نەك وەك سەرۆکی کۆمپانیاکەی خۆی (بی ك) بۆ راوێژکاری. لە ماڵپەڕی ئایمیدا ئاماژە بەوە کرابوو کەوا کۆشنێر بۆ بەرژەوەندی دەوڵەتی گابون بە دوو دەراسەت بەشداربووە. ئەو هەواڵەش بۆ خوێنەرێکی فەزوولی ئەو زانیارییە بەئاسانی ناسەلمێندرێت، چونکە ماڵپەڕەکە لە نۆڤمبەری ساڵی ٢٠٠٨وە لە سەر تۆڕەکانی نێتەوە دیار نامینێت. ئایا نەمانی ئەو ماڵپەڕەو نەمانی لەسەر تۆڕیّ نێتەوە، پەیوەندی بە توێژینەوەو کاری چەند رۆژنامەنووسێکەوە هەبوو، کە لەسەر مەسەلەکە کاریان دەکرد...؟ لەسەر ماڵپەڕەکەدا تۆماری ئەوە هەبوو کەوا ئایمیدا لە چەندین بواردا لە ئەفریقیا لەنێوان ساڵانی ٢٠٠٢ تا ٢٠٠٧ کاریانکردووە، من هیچ زانیارییەکم لەسەر خزمەتگوزارییەکانی ئایمیدا لە گابون و کۆنگۆ نییە، ئەو دوو وڵاتەی کە کۆشنێر زۆر دەستی لەناویاندا هەبووە.

هەردوو سەرۆکی گابون و کۆنگۆ، (عومەر بانگو)و (ساسو نگیسو) فەرمانیان بە وەزیری تەندروستی وڵاتەکەی خۆیان دابوو، کۆنتراکت لەگەڵ ئایمیدا بکە، چونکە ئایمیدا بە دیدی ئەوان کۆشنێر خۆیەتی، چونکە کۆشنێر خۆی لە هەردوو پایتەخت لیبروفیل و برازافیل دەستپێشخەری تایبەتی زۆری هەبووە. هەردوو کۆنتراکتەکە بەخشندەو بەرچاوبوون، ئەو پارەیەی ئایمیدا لەگەڵ دەزگای ئەفریکا ستایس لە گابون لە ١٩ی ینایری ساڵی ٢٠٠٤ دەستی کەوتبوو دەگەیشتە زۆرتر لە دوو ملیۆن و نیو یورۆ، لەو پارەیەدا سەرەتا ئەو بڕی ٧٦٢٢٤٥ یورۆ وەردەگرێت، حکومەتی گابونیش لە ساڵی ٢٠٠٦ تەواوی

پارەکەی سەر ئەستۆی خۆی دابووە هەردوو دەزگاکە، ئەویش ۸۱۷ هەزار یورۆبوو.کۆشنێر بۆ وەرگرتن و مسۆگەرکردنی هەر پۆستێکی وەزارەی لە حکومەتی فەرەنسی پشتیوانی تەواوی کاندیدی سۆسیالیستەکانی بۆ سەرۆکایەتی ولات سیگۆلین روایال دەکات، لەلای ئەو پۆستەکە گرینگ بوو، کێ سەرۆکایەتی دەباتەوە گرینگ نەبوو. چونکە ئەو مەبەستی بوو زۆرتر کۆنتراکتی لە ولاتی کونگۆی بەدەست بکەوێت، بۆیەش بۆ ئەو مەبەستە سێجار دەفرێت بۆ برازافیل بۆ دیمانەی سەرۆك ساسوو ژمارەیەك لە وەزیرەکانی ئەوێندەرێ. ئەو مەبەستی بوو دەراسەتی سیستەمی تەندروستی لە گابون بکات، بێجگە لەو پرۆژەیە مەبەستی بوو پرۆژەکەی زەمانەتی تەندروستی و دەراسەتێك لە سەر دووبارە سازکردنەوەی نەخۆشخانەکەی زانکۆی برازافیل بکات.لە مانگی مارسی سالی ۲۰۰۷دا لە نووسینگەی هاورێیەکی کۆشنێر، (نیکۆلا نورمان) ئەوەی لەینایری ۲۰۰۷ەوە سەفیری فەرەنسا بوو لە کونگۆ کۆنتراکتەکە مۆردەکرێت، پارەکەی پرۆژەکەش دەگەیشتە یەك ملیۆن و ۸۰۰ هەزار یورۆ. ئایمیدا ٦۰۰ هەزار یورۆ بۆ سازدانەوەو نۆژنکردنەوەی نەخۆشخانەی زانکۆی برازافیل وەردەگرێت، سەرۆك ساسو زۆر بایەخی بەو پرۆژەیە دەدات، کە پارەکەی دەگەیشتە ۲۰ ملیار فەرەنگی ئەفریقی، پرسیارەکەش ئەوەیە دەبێ کۆشنێر بۆ بەکارخستنەوەی نەخۆشخانەکە چی بە سەرۆکی کونگۆیی گوتووبێت...؟

## بەیاخنەدان بە مندالانی غەزە

لە رۆژی ۱۸ی مایۆی سالی ۲۰۰۷ کۆشنێر پۆستی وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسی وەردەگرێت، لەو پۆستەدا پشت بە هاورێیەکانی دەبەستێت، جاك بودوان (دامەزرێنەری ئەفریکا ستایس و شەریکی ئەیریك دانون) دەکاتە بەرپرسی پەیوەندییەکانی وەزارەت. سەرۆك ساسو لە هوتێلی مۆریس پێشوازی لە سکرتێری هاوکاری دەولەت (جان ماری بوکال) دەکات، لەوێ لیستی پێویستییەکانی نەخۆشخانەی زانکۆیی برازافیلی تەسلیم دەکات، کۆنتراکتێك لەگەل ئایمیدا لەلای سەرۆك دەکات، واتە وابەستەیی حکومەتی فەرەنسا

دەگەێنێت. بەڵام لەوێ پەیامنێرەکەی بوکال، سەرۆکی کونگۆیی سەرسام دەکات کە پێیدەڵێت مەسەلەکە وا نییە، بەو شێوەیەش نییە. کە سەرۆکەکە ئەو قسەیە دەبیستێت، یەکسەرو راستەوخۆ پەیوەندی بە سەرۆکی فەرەنسی نیکۆلا سارکۆزییەوە دەکات، بۆیە سارکۆزی ئاگاداری دەکاتەوە کەوا ئەو بەرنامەیە هاوکارییە لە مانگی سپتەمبەر دووبارە چاوی پێدادەخشێندرێتەوە، لەوێیدا ئەوەی مەبەستت بوو بۆت مەیسەر دەبێت.

پاش ئەوەی کۆشنێر دەبێتە وەزیری دەرەوە، (ئایریك دانون)ی هاوڕێی دەکاتە سەفیری فوقە ئەلعادەی فەرەنسا لە موناکو، ئەو سەرۆکی پۆستی ئایمیدا لەبیر ناکات، لەوێیەوە داوا لە گابون دەکاتەوە پارەکانی سەریان کە دەکاتە ٨١٧ هەزار یورۆ تەسلیم بکەنەوە.

کۆشنێر دەتوانێت هاوڕێیەکانی چەندین کۆنتراك لە وڵاتانی ئەفریقیا بکەن، کە پارەکەی دەگەیشتە ٤،٦ ملیۆن یورۆ. کۆنتراکتەکان ئەگەرچی هیچیان بەناوی وەزیری دەرەوە نەبوون، بەڵام ئەو بەرپرسی هەموو دەزگا گشتییەکان بوو، ئەوانەی مۆرکی دەوڵییان پێوەبوو کە لەلایەن حکومەتەکەی رافارانەوە پێی راسپێردرابوو. کۆشنێر راستەوخۆ کەسێکی بەرپرس نەبوو لە کۆمپانیای ئایمیدا کە چەندین پرۆژەی دەراساتی لە گابون و کونگۆو چەند وڵاتانی تری ئەفریقی کردبوو، بەڵام ئەو حکومەتەکانی هانددا ئەو جۆرە کۆنتراکتانە مۆر بکەن، هەر ئەویش فەرمانبەرەکانی وەزارەتەکەی خۆی لەو دەزگایانە دادەمەزراند.

کۆشنێر بۆ کەمکردنی ئازارو ئەهامەتییەکانی جیهان چیتر فەردە برنجی بەشان نەگواستووتەوە، وەك چۆن پەیوەندییەکانی لەگەڵ چەپەکان دەبڕێت، ئەوە فرانس دکتۆرە کەوا سارکۆزی لە هەفتەکانی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٩دا رازی دەکات، پردەکانی یارمەتی بۆ ئەو مندااڵانەی لە غەزە بەر تۆپە فسفۆرییەکان دەکەون نەبات، وەك چۆن سەرۆك میترانیشی رازی کرد بۆ کردنەوەی فرۆکەخانەی سەرایيڤۆ. ئەوەی لە کۆتاییدا دەبێتەوە کەسە خۆبەختکەرەکەی پێشووی پزیشکانی بێ سنوور، دەبێتە قوربانی ئەو وێنەیەی ویستی لە سەرەتاوە بۆ خۆی بیکێشێت.

(کۆتایی)

سەبارەت بەو کتێبە (تەیب نەلبەشیر) لە رۆژنامەی (الاتحاد)ی ئیماراتی رۆژی ١ی نەپریلی ٢٠٠٩ ئەو وتارەی نووسیبوو، بۆ تۆمارکردنی بۆچوونێك لەسەر کتێبەکەمان ئەوەمان بە کوردی کردووتە پاشکۆیەکی کورتی کتێبەکەمان.

لە رۆژی ٤ی فبرایری ساڵی ٢٠٠٩ ئەو کتێبە دەرچووە، بە ناراستەی سیاسی و راگەیاندنەوە دەنگۆیەکی زۆری هەبووە. نووسەرەکەی ژوورنالیستێکی ناوداری فەرەنسییە، لە بژارکردنی بەسەرهاتەکان و سازکردنی ریپۆرتاژیش ناودارە، ئەو بە چەندین کتێبی تر ناوداری دەرکردووە، بەتایبەتی ئەو کتێبەی رووی شاراوەی چەند لایەنی رۆژنامە ناودارەکەی فەرەنسا لۆمۆندی تێدا هەڵدەداتەوە، یان ئەو کتێبەی کە زۆر لایەنی سی ڤی سەرۆکی پێشووی فەرەنسی ڤالیری جیسکار دیستانی لەسەر وەرگرتنی چەند پارچە ئەڵماسێك لە بۆکاسای ئیمپراتۆری ئەفریقیای ناوەراستی ئەوکات هەڵدەداتەوە.

لەو کتێبەدا پەردە لە زۆر لایەنی وەزیری دەرەوەی فەرەنسی هەڵدەداتەوە، وەك هەڵسوکەوتە سیاسیی و داراییەکان، یان ناسراوی ئەو بە هەڤاڵبەندی بە پەیمانەکانی ئەمریکی و بریتانی، لە کتێبەکەدا ئەو تاوانبار دەکەن، کەوا ئەو سەربەخۆیی فەرەنسی لەدەستداوە، باسیش لە مۆرکردنی چەند کۆنتراکت دەکات بەرامبەر برە پارەیەك. کە کۆشنێر ئەندامی پەرلەمانی ئەوروپی بووە لە ستراسبۆرگی باکووری خۆرهەڵاتی فەرەنسا، لەوێ بە ئەنقەست ئەدرێسی خۆی بە ناو دوورگەی کورسیکای خواروو ناوبردووە نەك پاریس کە خۆی لەوێدا ژیاوە، بەوەش پارەیەکی زۆرتری وەرگرتووە.

لە یارییەکی سپۆرتدا لە ساڵی ٢٠٠٧دا کە نێوان هەڵبژاردەی فەرەنسی و ئینگلیزیدا کراوە، کە سروودی ئینگلیزی لێدراوە ئەو هەڵساوەتەوە، کە دەڵێت، خودا شاژنمان بۆ بپارێزێت، بەڵام کە سروودە

فەرەنسییەکە نۆرەی هاتوود ئەو لە شوێنی خۆییدا هەڵئەستاوە. بیار بیونی نووسەری کتێبەکە کە بە ناوی (جیهانی لە دیدی تۆ ك)، ئەو خاڵانەی بە وردی وەك رەمز بەکارهێناوە، ئەو وەك کەسێکی جوولەکە پابەندی بۆ سیاسەتی بریتانی ئەمریکی زۆر بووەو زۆریش رێنمایی وەرگرتووە. نووسەردکە دەڵێت، ئەو رقی زۆری لە دیگۆلییەت بووە، لەگەڵ بنچینەکانی سەرەتایی شۆرشی فەرەنسی کۆك نەبووە، ئەو بە بەرنامە کارکەربووە تا فەرەنسا سەربەخۆیی بڕیارەکانی نەبێت و گوێرایەلی پەیمانی ئەمریکی بریتانی بێت، تا وڵاتەکە لاوازو کز بمینێتەوە.

ئەو نووسیویەتی گوایە ئەو سەرەرای ئەوەی پۆستی وەزاری هەبوو، بە پارە کاری راوێژکاری بواری تەندروستی بۆ سەرۆکە ئەفریقییەکانی وەك سەرۆکی گابونی عومەر بانگۆو سەرۆکی کۆنگۆلی دانیس ساسۆ ئانگیستۆ، بە پارەیەکی زۆر کردووە، ئەو پێش ئەوەی ببێتە وەزیریش ئەو راوێژانەی کردووە، گلەییەکەش لەوەدایە ئەو پاش ئەوەی دەبێتە ودزیریش ئەو کارانەی بەرامبەر بە پارە کردووە، دیارە نووسەرەکە وا دەزانێت ئەو پۆستەکەی خۆی بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکارهێناوە، کاری ئەو لە پۆستەکەی و کۆنتراکتەکان تێکەڵکردووە.

لە کتێبەکەدا نووسراوە کەوا ئەو لە دوو کۆمپانیای کە دوو خزمی خۆی بەڕێوەیان دەبرد کۆنتراکتی بای ٤,٦ ملیۆن یورۆ کردووە، بۆ سازکردن و پێشکەشکردنی رێنمایی لە بواری پزیشکییدا. نووسەرەکە پشت ئەستوور بە سەرچاوەی باوەڕپێکراو نووسیویەتی گوایە سەرۆکی گابۆنی پارەکەی هەموو نەداوەتە کۆمپانیاکەو بەشێکی لەلا ماوەتەوە، کە کۆشنێر دەبێتە وەزیری دەرەوەی فەرەنسی لە یەکەم سەردانی سەرۆکی گابۆنی عومەر بانگۆ پاش ئەوەی سارکۆزی دەبێتە سەرۆك کۆمار بۆ پاریس، لە رۆژی ٢٥ی مانگی مایۆی سالّی ٢٠٠٧دا کۆشنێر لەوێ دەرفەتێك وەردەگرێت پارەکەی داوا بکاتەوە، نووسەردکە دەڵێت ئەو بە زەبری دەسەڵاتەکەی و پۆستەکەی خۆی بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکارهێناوە.

نووسـەرەکە بـەوەش کۆشـنێری تاوانبـارکردووە، کـەوا ئـەو دوو بەرپرسـی کۆمپانیاکـەی لـە دوو پۆسـتی باڵـا دادەنێـت، یەکـەمیان دەکاتـە سـەفیری فەرەنسا لـە مونـاکو، دووەمیـشیان دەکاتـە بەرێوەبـەری گەیانـدنی دیـوانی وەزارەت، لەوێـیدا ئـەو بروسـکەیەك بـۆ دەوڵـەتی گـابونی دەکـات، کـەوا سەرۆکەکەیان لـە دوا سـەردانەکەییدا بـەڵێنی بـە وەزیرەکـەیان دابـوو کـەوا قـەرزەکانی کۆمپانییەکـەیان بداتـەوەو داواش دەکـات بـە زووتـرین کـات بەڵێنەکەی جێبەجێ بکات.

یـەکێك لـەو کارانـەی نووسـەری کتێبەکـە کۆشـنێری پـێ تاوانبارکردووە، کـە ژنەکـەی خـۆی کریـستین ئوکرانـت دەکاتـە بەرێوەبـەری گشتی چەندین کەناڵی تەلەڤزیۆنی و رادیۆیی ئاراستەکراو بۆ دەرەوە، لەوانە فرانس ٢٤و ئیستگەی فەرەنسای دەوڵی و تی ڤی ٥. ئـەوەی شـایانی باسـە هاوسەرەکەی ئەو ژوورنالیستێکی تەلەڤزیۆنی ناودارە. دانانی ئـەو ژنـە لـەو پۆستە زۆر قسەی لەسەرکرا، بەتایبەتی کە رۆژنامەنووسـێکی لـەو دەزگایـە لەسەر کار دەردەکات، لەسـەر ئـەوەی گوایـە لـە دیمانەیـەکی تەلەڤزیۆنییـدا پرسیاری رەقی لە وەزیری مێردی کردبوو.

لەو کتێبەدا نووسەرەکەی دەڵێت، کەوا کۆشـنێر کەسێکی دووررو بـووە. ئەو سەرەتا پزیشك بووەو لە ساڵی ١٩٧٠ رێکخراوی دکتـۆرانی بـێ سـنوور بۆ کۆمەك و یارمەتی خەڵکانی لێقـەوماوو دەربـەدەر دادەمـەزرێنێت، ئـەو دکتۆرە تەمەن ٧٠ ساڵییە پاش کارەکانی لە سۆماڵ ناوی دەرکردووە، کە لە میدیاکاندا بە وێنەیـەکی فـەردە بـرنج لەسەرشـانی دەردەچێت، لەولاشـەوە پیاوێکە زۆرجاریش کۆششی کردووە بە رێگای ناشەرعیش پارە کۆبکاتـەوە. ئەو قسەیەشی لەسەرە کە چەند سـەرکردەی ئـەفریقی بـە تاوانـەکانی دژ بـە مرۆڤایەتی تاوانبارکردووە.

نووسـەرەکە دەڵێـت ئـەو لـە پەیوەنـدی و مامەڵـەکردن لـە دۆسـتییەکانی دەرەوە وەك وەزیـری دەرەوە جیـاوازی کـردووەو لـەناو وەزارەتەکـەی خۆشـیدا قـسەی لەسـەر پەیوەندییـەکان هـەبووە، لەسـەر

دۆسـێیەی چـین و دارفـۆردا لایـەنگیری کـردووە. ئەبەرنـەوەی وەزیرەکـە بەرپەچەڵەئ جوولەکەبووە، بۆیە زوو نووسەرەکەی بـەوە تاوانبـارکردووە کـەوا ئەو دژی سامییەت بووە، نووسـەرەکەش وتوویـەتی کـەوا کۆشـنێر هانـدەری کارو بەرنامەکەی لەسەر بنچینەی جوولەکـەیی بـووە. کۆشـنێر لـە وەڵـامی کتێبەکەدا وتوویەتی، کتێبەکە تەژییە لـە زانیـاری هەڵبەسـتراوو سـەخیف، لەپێش پەرلەمانیشدا وتوویەتی:

هەموو کاردکانی من شەفاف بوون و من ڕێزی یاسام گرتووە.

وەرگێڕ لە چەند دێرێکدا:

لە ١٩٥٥ لە شاری دێرینی (هەولێر) لەدایکبووم.

ئامۆژگای تەکنەلۆژیای بەغدام تەواوکردووە.

تا لە وڵات دەرچووم فەرمانبەری شارەوانی هەولێر بووم.

لە ساڵی ١٩٩٨ ەوە لە وڵاتی سوید دەژیم.

## چاپکراوەکانم ...

لە یادی سەد ساڵەی شارەوانیدا، ١٩٨٥ کتێبی (هەولێر )م بە قەبارەی ٣٦٥ لاپەرە ئامادەو چاپکرد.

هەر لە شارەوانیدا لە ساڵی ١٩٩٤ دا، ١٢ ژمارەی رۆژنامەی(هەولێر)م دەرکرد.

کەلاوە... ١٩٩١ ریپۆرتاژ، بۆ ئۆردوگاکانی دەڤەری هەولێر.

دیوەخانی فلێن... رۆژانەو ریپۆرتاژە،لە ١٩٩٩ لە رۆژنامەی (ئاڵای ئازادی)ی زەحمەتکێشان لە دە ئەڵقەی درێژ بڵاوکرایەوە.

هەولێر... تا دبلن...... ٢٠٠٠ ریپۆرتاژ، زانکۆی ئازادی بەرلین.

بەغدا.... بۆ هەولێر!..... ٢٠٠٠ ریپۆرتاژ، سویدو سلێمانی.

مەملەکەتی فارگۆنەکان.....٢٠٠١ ریپۆرتاژ، سلێمانی.

کاکە، ئەبو ئیسماعیل... ٢٠٠١ ، بیرەوەری سلێمانی.

بەسەرهاتی دەریاوانێکی خنکاو ٢٠٠١ رۆمانی گابریل مارکیز، لە ژمارە ٢٥ی گۆڤاری (ئاینده)ی سلێمانی بلاوکرایەوە، وەك نامیلکەش بلاوکرایەوە.

دە رۆژەکەی هەولێرم، (١١) وتارو ریپۆرتاژبوو لە گۆڤاری (گولان)ی هەولێرو رۆژنامەی (کورد) لە ئوستراليا بلاوکرایەوە.

رێگای دوورم بۆ ئازادی، نیلسۆن ماندیلا، وەرگێران. هەولێر لە دەزگای موکریانی بلاوکرایەوە.

سارد، یان گەرم، (١٢) ریپۆرتاژبوو، لە رۆژنامەی (هەوال)ی سلێمانی لە یولیو ٢٠٠١ ی ینایری ٢٠٠٢ بلاوکرایەوەو وەك نامیلکەش بلاوکرایەوە.

فارگۆنەکان، ریپۆرتاژو بیرەوەرییە لە دەزگای بەدرخان لە هەولێر ٢٠٠٥ بلاوکرایەوە.

مەملەکەتی کەلاوە، وتارو پێناسەی بیناسازی کوردییە وەك نامیلکە لە وەزارەتی رۆشنبیری لە هەولێر بلاوکرایەوە.

کۆریا پێناسەو مێژووی کۆریای باشوور، لە خانەی وەرگێران لە هەولێر ٢٠٠٧ بلاوکرایەوە.

هولۆکۆست... کتێبێکە لەسەر قرکردنی جولەکە لە ئەوروپا، وەرگێران سەنتەری نما هەولێر ٢٠٠٧.

دوو پرێنسیسی ئازداری بێناز، دیاناو ماساکۆ... هەولێر دەزگای ئاراس ٢٠٠٨.

مارتن لۆسەر وەرگێران و ئامادەکردن، بەشێکە لە کتێبی ناتوندوتیژی ١ سەنتەری مەسەلە هەولێر ٢٠٠٨.

بەرەو کۆشکی ئالیزی ، شیراك، روایال، سارکۆزی ..و: خانەی وەرگێران سلێمانی ٢٠٠٨.

سێکس و پۆلیتیك، دیوێکە لە ژیانی دبلۆماتی فەرەنسای نوێ...و: دەزگای سەردەم ٢٠٠٨

تەها حوسێن، نابینایەکی بینا، وەرگێڕان و ئامادەکردن.. دۆسیێیەکە لە گۆڤاری ئما ٢٠٠٨

٩٥٥ دەقە لەگەڵ شێرکۆ بێکەس دیمانە دەزگای ئما ٢٠٠٨

دۆلار لە ئەمریکا، دوو بابەتی ئابوورییە....و: دەزگای ئاراس ٢٠٠٨

مەجبوور، سەربردەو بیرەوەرییە... سلێمانی ٢٠٠٨

من رۆژنامەنووسم، جاسووس نیم... وەرگێڕان خانەی وەرگێڕان سلێمانی ٢٠٠٩

مۆساد... وەرگێران هەولێر بڵاوکراوەی ئاوێر ٢٠٠٩

دانپێدانانەکانی حاجی پاولۆ ... وەرگێڕان بڵاوکراوەی ئاوێر ٢٠٠٩ ترێنە خێراکەی خۆرهەڵات... دەزگای موکریانی ٢٠٠٩

ئامادەی چاپە :

هەتان... چەند وتارێکە لەسەر بیناسازی کوردەواری، لە ساڵی ١٩٨٨ دوە ئامادەیە.

کاکە ئەبو خەلیل ... بەسەرهات و گێڕانەوە .. سوید ٢٠٠٨

سیڤییەکان ١... کۆمەڵە دیدارێکە ئامادەکردن و وەرگێڕان ٢٠٠٢ ٢٠٠٩

سیڤییەکان ٢... کۆمەڵە دیدارێکە ئامادەکردن و وەرگێڕان ٢٠٠٢ ٢٠٠٩

برادەرە جوانەکە وەرگێڕان سوید ٢٠٠٩

دەسەڵاتی دوو ژن ... وەرگێڕان

نهێنی بۆکسە رەشەکە وەرگێڕان

پاوەری سەرۆکە نەخۆشەکان وەرگێڕان

بەهەشتی زیندان... وتارو ریپۆرتاژە لە ١٩٩٦ەوەو بەبەردەوامی دەینووسم، ئێستاش گۆشەی (بریڤ) لە چەندین گۆڤارو رۆژنامەو ماڵپەڕەکانا لەوڵات و دەرەوەی وڵات بڵاودەکەمەوە.